بسم الله الرحمن الرحيم

# بەخششەکانی میهرەبانی
# لە راڤەکردنی چل فەرموودەی
# قورئانی






ناوی کتێب: بەخششەکانی میهرەبانی لە راڤەکردنی چل فەرموودەی قورئانی.

نووسینــــــــــــــی: د.نەریمان سابیر حەمەد شوانی.

نۆرەو ساڵی چـــاپ: چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٢١.

ژمـارەی سپـــــاردن:( ٣٥٤ )ی ساڵی ( ٢٠٢١ ) ی پێدراوە.

---

# دەزگای چاپ و پەخشی

# نارین

هەولێر/ بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی

Website: www.nareenpub.com

E-mail: nareenpub@gmail.com

مۆبایل:٠٠٩٦٤٧٥٠٤٠٦٤٦١٠

# پێشەكی

خــــودای پــــەروەردگار بەخششــــەكانی بەســــەر بەنــــدە زیــــاد دەكــــات ، بــــە تــــەواو كردنــــی (بەخششــــەكانی میهرەبــــانی لــــە ڕاڤــەكردنی چــل فــەرمودەی قورئــانی) ، كــە ئەمــە ڕاڤــەكردنی پەرتوكێكـــە بـــە نـــاوی (چـــل فـــەرمودەی قورئـــانی) كـــە خاوەنەكــەی نــاوی (أحمــد عبــدالرزاق آل إبــراهیم العنقــری)ە ، لـە خـودای پـەروەردگار داواكـارم لێمـان وەربگرێـت، وبیكـات بـۆ توێشــووی قیامــەت ، وە ببێتــە مایــەی لێخۆشــبوونی گونــاه و كەموكورتی یەكانمان .

قورئــان گوفتــاری خــوای پــەروەردگارە ،و دروســتكراو نیــە ، لــە لایــەن خــوای پــەروەردگار دابــەزیوە و، دەگەڕێتــەوە لای خــوای پــــەروەردگار .گوفتــــار ســــیفەتێكی خــــوای پــــەروەردگارە ، خـودای پـەروەردگار هـەر سـاتێك بیـەوێت قسـەدەكات وە چـۆن بیــەوێت قســە دەكــات ، وە موعتەزیلــە پــیێ یــان وایــە قورئــان دروســتكراوی خوایــە ، وە خــوای پــەروەردگار قســە ناكــات، وە دەبێــت ئــەوەش بــزانین كــە موعتەزیلــە كۆمــەڵێكن لــە كۆمەڵــە گومڕاكان.

قورئـــان گوفتـــاری خـــودای پـــەروەردگارە ، كـــە پیرۆزتـــرین پەرتوكــە ، كــە پیرۆزتــرین فریشــتە هێناویەتــە خــوارەوە ،بــۆ ســەر پیرۆزتــرین بەنــدە دابــەزیوە كــە پێغەمبــەری خوایــە (درووود

وســـەلامی خـــوای لەســـەر بێــت) ، وە لـــە پیرۆزتـــرین مـــانگ دابـــەزیوە کـــە مـــانگی ڕەمەزانـــە ، وە لـــە پیرۆزتـــرین شـــوێنی سەر زەوی کە مەککە و مەدینەیە .

قورئـــان بەرنامـــەی خـــوای پـــەروەردگارە ، ڕوناکیـــە بـــۆ ســـەر دڵـــەکان ، ڕێنیشـــاندەرە بـــۆ مرۆڤـــەکان بـــەرەو بەهەشـــت، ڕزگارکـــەری مرۆڤەکانـــە لـــە دۆزەخ ، لابـــەری خـــەم وپەژارەکانـــە لـە دونیـا ، تکاکـارە بـۆ بـڕواداران لـە نـاو گـۆڕ لـە ڕۆژی دوامـایی، زیندووکـــەرەوەی دڵـــە مردووەکانـــە لـــە دونیـــا ، سەرچـــاوەی هـــەموو حیکمەتێکـــە ، مـــوعجیزەی خـــوای پـــەروەردگارە ، سەرچـاوەی هـەموو گەنجینەیەکـە ، چـەند لـە قورئـان نزیـك بیـت ئەوەنـدە لـە خـوای پـەروەردگار نزیکـی ، قورئـان گـەورەترین گۆڕانکـاری لـە ژیـانی مرۆڤـەکان دروسـت دەکـات، قورئـان ژیانەوەیـە ، هەرکەسێك ژیـانی لەگـەڵ قورئـان بێـت ، بـە تیـۆری و بە کرداری ، لەززەت وچێژی ڕاستەقینە دەچێژێت.

ولـــە کۆتـــایی زۆر سوپاســـی بـــێ پایـــانی پەرتوکخانـــەی نـــارین دەکـــەم کـــە ئـــەرکی لەچـــاپدانی ئـــەم نوســـینە پڕفـــەر وبەرەکەتـــەیان گرتـــە ئەســـتۆی خۆیـــان، خـــوای پـــەروەردگار بەرەکەت بخاتە هەموو کارەکانیان.

د.نەریمان سابیر حەمەد شوانی

١/شەعبان/١٤٤٢

# الحديث الأول: فەرمووده‌ی یەكەم

عَـنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ (ﷺ)، عَـنِ النَّبِـيِّ (ﷺ) قَـالَ «مَـا اجْتَمَـعَ قَـوْمٌ فِي بَيْـتٍ مِـنْ بُيُـوتِ اللَّـهِ تَعَـالَى،يَتْلُونَ كِتَـابَ اللَّـهِ وَيَتَدَارَسُـونَهُ بَيْـنَهُمْ،إِلا نَزَلَـتْ عَلَـيْهِمْ السَّـكِينَةُ، وَغَشِـيَتْهُمْ الرَّحْمَــةُ،وَحَفَّتْ بِهِـمْ الْمَلَائِكَـةُ، وَذَكَرَهُمْ اللَّـهُ فِـيمَنْ عِنْـدَهُ وَمَـنْ بَطَّأَ بِـهِ عَمَلُـهُ لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ».

ئەبو هورەیره (خوای لێـی ڕازی بێت)دەگێڕتـەوە كـە پێغەمبـەری خــوا(درودو وســەلامی خــوای لەســەر بێت)فەرموویــەتی :((هــەر كۆمـەڵێك لـە ماڵێـك لـە ماڵـەكانی خـوا بـۆ خوێندنـەوەو فێربـوون وشیكردنەوەی قورئان كۆ ببنەوە، ئـەوا خـوا پـەروەردگار ئارامیـان بەسـەردا دەڕێـژێت، وبـەزەیی خـوا دایاندەپۆشێت،فریشـتەكانیش دەورەیان دەدەن،وە خوای پەروەردگاریش لە لای فریشتەكان باس وستایشیان دەكـەن ، هـەر كەسێك كردەوەكـانی بـەرەو بەهەشـتی نـەبات، نـەژاد و ڕەچـەڵەك پێشـی ناخـەن و دادی نـادەن و بـەرەو بەهەشتی نابەن )

## تەخریج

أخرجه مسلم في كتاب الذكر والدعاء والتوبة والاستغفار باب:(بَابُ فَضْلِ الِاجْتِمَاعِ عَلَى تِلَاوَةِ الْقُرْآنِ وَعَلَى الذِّكْرِ)، (رقم الحديث:(٣٨-(٢٦٩٩)، (ص١٢٤٢)،وأبو داود في كتاب الصلاة، باب:(في ثواب قراءة القرآن)،رقم الحديث:١٤٥٥) (ص٢٢٥)، صححه الألباني في صحيح سنن أبي داود (٤٠٠/١)، والترمذي في كتاب القراءات عن رسول الله (ﷺ) باب:()،(رقم الحديث: ٢٩٤٥)(ص٦٥٨)،صححه الألباني في صحيح سنن الترمذي (١٧٦/٣)،وابن ماجة في كتاب المقدمة، بَابُ:(فَضْلِ الْعُلَمَاءِ وَالْحَثِّ عَلَى طَلَبِ الْعِلْمِ)،رقم الحديث:(٢٢٥) (ص٥٧)، صححه الألباني في صحيح سنن ابن ماجة (١٨٥)(٩٢/١)، والدارمي في كتاب المقدمة، بَابٌ: (فِي فَضْلِ الْعِلْمِ وَالْعَالِمِ)،رقم الحديث:(٣٥٠) (١٠٥/١)،والبيهقي في شعب الإيمان بابٌ:(فِي تَعَظِيمِ الْقُرْآنِ)، فَصْلٌ:(فِي إِدْمَانِ تِلَاوَةِ الْقُرْآنِ)(رقم الحديث: ١٨٢٣)(١٥٣/٤)، قال محققه الدكتور:عبدالعلي عبدالحميد حامد:إسناده صحيح.وأحمد في مسنده في مسند أبي هريرة (رضي الله عنه): (رقم الحديث:٧٤٢٧)،(٣٩٣/١٢) وقال المحققان: شعيب الأرنؤوط وعادل مرشد:(إسناده صحيح على شرط الشيخين)، وابن حبان في صحيحه في كتاب الرقائق باب:(ذِكْرُ حُفُوفِ الْمَلَائِكَةِ بِالْقَوْمِ الَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ وَيَتَدَارَسُونَهُ فِيمَا بَيْنَهُمْ، مَعَ الْبَيَانِ بِأَنَّ الرَّحْمَةَ تَشْمَلُهُمْ فِي ذَلِكَ) الْوَقْتِ) رقم الحديث:٧٦٧) (ص٣١٥)، وأبو يعلي الموصلي في مسنده في مسند أبي سعيد الخدري، (رقم الحديث:١٢٧٨) (٥٤٣/١)،والبغوي في شرح السنة في كتاب العلم بَابُ:(فَضْلِ الْعِلْمِ) (رقم الحديث:١٢٧) (١٨٧/١) وقال محققه سعيد اللحام:(هذا حديث صحيح)،وابن الأعرابي في معجمه،(رقم الحديث:٢٠٦٤)(٩٧٠/٣)، ورواية ابن أبي شيبة (٢٩٤٦٨)،(٦١/٦)) " مَا اجْتَمَعَ قَوْمٌ قَطُّ يَذْكُرُونَ اللَّهَ، إِلَّا نَادَى مُنَادٍ مِنَ السَّمَاءِ: قُومُوا مَغْفُورًا لَكُمْ، قَدْ بُدِّلَتْ سَيِّئَاتُكُمْ حَسَنَاتٍ "





## ژیانی ئەبو هورەیرە ( خوا لێی ڕازی بێت )

ناوی خۆی عەبولڕەحمانی کوڕی سەخڕە ،بە هەژاری لە ساڵی نۆزدەی پێش کۆچی لە دایك بووە ،لە جەنگی خەیبەر لە ساڵی حەفتەمی کۆچی ،لە تەمەنی ٢٨ ساڵی موسوڵمان بووە وکۆچی کردووە بۆ مەدینە،وە بەشداری جەنگی خەیبەری کردووە،وە پێنج هەزارو سێسەدو حەفتاو چوار فەرموودەی لە پێغەمبەر(درودو سەلامی خوای لەسەر بێت)گێڕاوەتەوە، وپێنجسەدو حەڤدە فەرموودەی لە دوو پەرتوکی ڕاست ودروستی بوخاری وموسلیم هەیە، سێسەدوبیست وشەش فەرموودە موتتەفەق عەلیە ، نەوەدو سێ فەرمودە بە تەنیا لە بوخاری ڕیوایەت کراوە ، وە نەوەدو هەشت فەرموودە بە تەنیا پێشەوا موسلیم ڕیوایەتی کردووە ، کەواتە لە بوخاری ٤١٩ فەرمودەی ئەبو هورەیرەی تێدایە ، وە لە موسلیمیش ٤٢٤ فەرمودەی تێدایە ، وە لە ساڵی ٥٧ ی کۆچی وەفاتی کردووە.

## سوودو پەندەکانی ئەم فەرمووده

١. پەیوەستکردنی دڵ بە ماڵی خوا کە مزگەوتە تا بکەوێتە ژێر سێبەری خوا .

٢. فەزڵی کۆبوونەوە لە ماڵی خوای پەروەردگار .

٣. سووربوون لە بەژداریکردن لە بازنەی زانستی شەرعی و خوێندنەوەی قورئان و فێرکردنی قورئان .

٤. فەزڵ و گەورەیی خوێندن و فێرکردنی قورئان .

٥. شیکردنەوەی قورئان و خوێندنەوەی قورئان و فێرکردنی قورئان دەبێتەوە مایەی دابەزینی ئارامی .

٦. شیکردنەوەی قورئان و خوێندنەوەی قورئان و فێرکردنی قورئان دەبێتەوە مایەی ڕەحمەتی خوا داینپۆشیت .

٧. شیکردنەوەی قورئان و خوێندنەوەی قورئان و فێرکردنی قورئان دەبێتەوە مایەی خوای پەروەردگار لە لایەن فریشتەکان ناویان بهێنێت .

٨. ئەگەر کەسێك کرداری چاکی نەبێت بۆ ئەوەی بەرەو بەهەشتی ببات ، ئەوا نەژاد و ڕەچەلەك وشیخایەتی و سەییدایەتی و دەروێشایەتی و مەلایەتی وخزمایەتی لە پێغەمبەر (دروودو

سەلامی خوای لەسەر بێت)دادیان نادات، هەر بۆیەش ئەبو لەهەب کە مامی پێغەمبەر(درووودو سەلامی خوای لەسەر بێت) بوو، کە تا رۆژی دوامایی نەفرەتی بۆ دەچێت،وە پێغەمبەر(درووودو سەلامی خوای لەسەر بێت) هیچ سوودێکی بۆ نەبوو وە بۆیشی نابێت تا رۆژی دوامایی،وە ئایەتیشی لەسەر دابەزی ﴿ تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ۝١ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ۝٢ سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ ۝٣ وَٱمْرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ ۝٤ فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍ ۝٥ ﴾ المسد: ١ –٥ ، ئەگەر بە نەژاد و خزمایەتی بووایە نەدەبوایە ئایەتی بەسەردا دابەزیبوایە ، بەلام ئەمە دین و باوەڕە .

٩. فەزڵ وگەورەیی کۆبوونەوە لە پێناو خوای پەروەردگار .

١٠. نزیکبوونەوە لە خوای پەروەردگار بە کردارە نەك بە نەسەب.

# الحديث الثاني: فەرموودەی دووەم

عَـنْ عَبْدِاللَّـهِ بْـنَ مَسْـعُود(رضي الله عنه)، يَقُـولُ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـه (ﷺ): ‹ مَنْ قَرَأَ حَرْفًـا مِـنْ كِتَـابِ اللَّـهِ فَلَـهُ بِـهِ حَسَـنَةٌ، وَالحَسَـنَةُ بِعَشْـرِ أَمْثَالِهَـا، لا أَقُـولُ ﴿الٓمٓ﴾ حَـرْفٌ، وَلَكِـنْ أَلِـفٌ حَـرْفٌ وَلامٌ حَـرْفٌ وَمِيمٌ حَرْفٌ »

عەبـدوللای کـوڕی مەسـعود(خوا لێـی ڕازی بێت)دەگێڕتەوە:کـە پێغەمبەری خوا(درودو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی:هەر کەسـێك پیتێـك لـە قورئـان بخوێنێتـەوە ، ئـەوا چـاکەیەکی بـۆ دەنوسرێت ، وە هەر چاکەیەکیش بە دەقات بۆی هەژمار دەکرێت ، مـن نـاڵێم ﴿الٓمٓ﴾ پیتێکـە ، بـەڵام ( أَلِـفٌ ) پیتێکـە ،( لا ) پیتێکـە ( مِيم ) پیتێکە))

## تەخریج

أخرجه الترمذي في كتاب ثواب القرآن بَابُ:(مَا جَاءَ فِيمَنْ قَرَأَ حَرْفًا مِنَ الْقُرْآنِ مَالَهُ مِنَ الأَجْرِ) رقم الحديث:(٢٩١٠) (ص٦٥١)،صححه الألباني في صحيح سنن الترمذي(١٦٤/٣)،والدارمي في كتاب فضائل القرآن بَابُ: فَضْلِ مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ،رقم الحديث:٣١٩٠)(٨٨٧/٢)،والبيهقي في شعب الإيمان بابٌ:(فِي تَعْظِيمِ الْقُرْآنِ)،فَصْلٌ: (فِي إِدْمَانِ تِلاوَةِ القُرْآنِ)(رقم الحديث:١٨٣٠) (١٦١/٤)، وابن أبي شيبة في كتاب فضائل القرآن، باب:(ثواب من قرأ حروف القرآن)، (رقم الحديث:٢٩٩٢٣)(٢١٨/٦)

## كورتەی ژیانی عەبدوڵڵای كوڕی مەسعود( خوا لێی ڕازی بێت )

**عەبدوڵڵای كوڕی مەسعود(خوا لێی ڕازی بێت)لە سەرەتاكانی ئیسلام موسوڵمان بووە، و بەژداری جەنگی بەدری كردووە، دەفەرموێ:ڕۆژێكم بیر دێ كە ئێمە بە هەمووی شەش كەس موسوڵمان بووین وە منیش شەشەم موسوڵمان بووم،دوو كۆچی كردووە یەكەم بۆ حەبەشە ودووهەمیان بۆ مەدینە،لەدوای كۆچكردن بۆ مەدینە پێغەمبەر(درودو سەلامی خوای لەسەر بێت) لەگەڵ موعازی كوڕی جەبەل كردنی بە برا،وە هەشسەد وچل وهەشت فەرمودەی گێڕاوەتەوە ،٦٤ فەرمودە هەردوو پێشەوا بوخاری وموسلیم بەیەكەوە گێاڕاویانەتەوە،وە پێشەوا بوخاری بیست ویەك فەرمودەی بە ئینفرادی گێڕاوەتەوە كە پێشەوا موسلیم**

نەیگێڕاوەتەوە،وە پێشەوا موسلیمیش سی وپێنج فەرمودەی بە ئینفرادی گێڕاوەتەوە کە پێشەوا بوخاری نەیگێڕاوەتەوە وە لە هاوەڵە فەقیهەکان و قاریئەکان دەژمێردرێت،کەواتە پێشەوا بوخاری بە هەمووی ٨٥ فەرمودەی گێڕاوەتەوە،وە پیشەوا موسلمیش بە هەمووی ٩٩ فەرموودەی گێڕاوەتەوە،وە یەکێکە لەو هاوڵانەی کە دوعایان گیرا دەبوو بە نزای پێغەمبەر (دروودو سەلامی خوای لەسەر بێت) بۆی، لە ساڵی سی ودوو ی کۆچی وەفاتی کردووە.

## سوودو پەندەکان

١. فەزڵی خوێندنەوەی قورئان .
٢. پیتەکانی قورئان دەنگدارە .
٣. هەر چاکەیەك لە لایەن مرۆڤ یان جنۆکە بە دە چاکە لە لایەن خوای پەروەردگار هەژمار دەکرێت .
٤. خوێندنەوەی هەر پیتێك لە قورئان چاکەیەکت بۆ دەنوسرێت ، وە هەر چاکەیەکیش لای خوای پەروەردگار بە دەچاکە هەژمار دەکرێت .
٥. ﴿الٓمٓ﴾ یەك پیت نی یە بەلکو سێ پیتە .

# الحديث الثالث: فەرمودەی سێیەم

عَـنْ أَبِي أُمَامَـةَ الْبَـاهِلِيِّ (ﷺ)، قَـالَ: سَـمِعْتُ رَسُـولَ اللـهِ (ﷺ)، يَقُـولُ « اقْـرَءُوا الْقُـرْآنَ فَإِنَّـهُ يَـأْتِي يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ شَـفِيعًا لِأَصْحَابِهِ».

**ئەبو ئومامەی باهلی(خودا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێ : گوێم لە پێغەمبەری خوا(درودو سەلامی خوای لەسەر بێت) بوو فەرمووی :((قورئان بخوێنن ، چونکە لە ڕۆژی دوامایی دەبێتە تکاکار بۆ خاوەنەکەی))**

## تەخریج

أخرجه مسلم في كتاب صلاة المسافرين وقصرها،بَابُ:(فَضْلِ قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ، وَسُورَةِ الْبَقَرَةِ) (رقم الحديث:٢٥٢-(٨٠٤)،(ص٣٦٢)، وابن حبان في صحيحه في كتاب العلم،باب:(ذِكْرُ الْحَثِّ عَلَى تَعْلِيمِ كِتَابِ اللَّهِ، وَإِنْ لَمْ يَتَعَلَّمِ الْإِنْسَانُ بِالتَّمَامِ)(رقم الحديث:١١٦) (ص١٤٤)،وأحمد في مسنده في مسند أبي أمامة الباهلي،(رقم الحديث:٢٢٢١٣) (٥٤٦/٣٦) وقال المحققون: حديث صحيح، والدارمي في كتاب فضائل القرآن، بَابُ: فِي فَضْلِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ وَآلِ عِمْرَانَ)(رقم الحديث:٦٢٦٨)(٩٠٧/٢)، والبيهقي في شعب الإيمان بابٌ:(فِي تَعْظِيمِ الْقُرْآنِ)، فَصْلٌ:(فِي ذِكْرِ سُورَةِ البَقَرَةِ وآلِ عِمْرانِ)(رقم الحديث: ٢١٥٦) (٤٤٤/٤)،وفي السنن

الصغير في كتاب فضائل القرآن، بَابٌ:(فِي فَضْلِ الْقُرْآنِ وَتَخْصِيصِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ وَآلِ عِمْرَانَ بِالذِّكْرِ)، (رقم الحديث:٤٦٧)، (٢٧٠/١)،وفي السنن الكبير في كتاب الصلاة بَابُ الْمُعَاهَدَةِ عَلَى قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ ((رقم الحديث:٤١١٣)(٢٩/٥)،والبغوي في شرح السنة في كتاب فضائل القرآن بَابُ فَضْلِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ وَآلِ عِمْرَانَ ((رقم الحديث:١١٩٠)(٢٤٨/٣)،وعبدالرزاق الصنعاني في مصنفه في كتاب فضائل القرآن بَابُ تَعْلِيمِ الْقُرْآنِ وَفَضْلِهِ) (رقم الحديث:٦٠١٠)(٢٢٣/٣).

## كورتەی ژیانی ئەبو ئومامەی باهلی

**ئەبو ئومامەی باهلی ناوی صودەی کوڕی عەجلانی کوڕی وەهبە هاوەڵی پێغەمبەرە (درودو سەلامی خوای لەسەر بێت)، هاتۆتە حمص و هەر لەوێش نیشتەجێ بووە ، لە حەجیماڵئاوایی تەمەنی سی ساڵ بوو ، دووسەدوپەنجا فەرمودەی لە پێغەمبەر(درودو سەلامی خوای لەسەر بێت) گێڕاوەتەوە ، لە ساڵی ٨٦ ی کۆچی وەفاتی کردووە.**

# سوودو پەندەکان

١. شەفاعەتەکانی پێغەمبەر (درودو سەلامی خوای لەسەر بێت)

**یەکەم:** شەفاعەتی هەرەگەورە .

**دووەم** : شەفاعەتی پێغەمبەر(درودو سەلامی خوای لەسەر بێت) بۆ ئەهلی مەدینە .

**سێهەم** :شەفاعەتی پێغەمبەر(درودو سەلامی خوای لەسەر بێت) بۆ بردنەژوورەوەی بڕواداران بەرەو بەهەشت.

**چوارەم** : شەفاعەتی پێغەمبەر(درودو سەلامی خوای لەسەر بێت) بۆ بەرزکردنەوەی پلەکانی ئەهلی بەهەشت .

**پێنجەم** : شەفاعەتی پێغەمبەر(درودو سەلامی خوای لەسەر بێت) بۆ کەسانێك کە شایانی ئاگرن ، شەفاعەتیان بۆ دەکات کە نەچنە ئاگر .

**شەشەم** : شەفاعەتی پێغەمبەر(درودو سەلامی خوای لەسەر بێت) بۆ خاوەنی گوناهە گەورەگان .

**حەفتەم** : شەفاعەتی پێغەمبەر(درودو سەلامی خوای لەسەر بێت) بۆ کەسانێك کە دەیانباتە بەهەشت بەبێ حیساب .

**هەشتەم** : شەفاعەتی پێغەمبەر(درودو سەلامی خوای لەسەر بێت) کە تایبەتە بە ئەبو طالب ، بۆ کەمکردنەوەی ئازار لەسەری .

٢. فەزڵی خوێندنەوەی قورئان .

٣. پاداشتی قورئان دەبێتە تکاکار لە ناو گۆڕ بۆ خاوەنەکەی ..

٤. پاداشتی قورئان دەبێتە تکاکار لە ڕۆژی دوامایی بۆ خاوەنەکەی .

٥. پاداشتی قورئان تکاکارە بۆ ئەهلی تەوحید ، بەڵام موشریك ودووڕوو ئەگەر لە هەموو خەڵکی قورئانی بە ئیتقانتر لەبەر بێت ئەوا بۆی نابێتە تکاکار ، چونکە لە دونیا کردەوەکانی هەڵوەشاوەتەوە .

٦. شێوازو چۆنیەتی تکاکردنی قورئان نازانرێت ، خوا خۆی زانایە .

٧. تکاکردن بێ باوەڕ ناگرێتەوە .

٨. تکاکردن دووڕوو ناگرێتەوە .

٩. هەموو پێغەمبەران (درودوسەلامی خوایان لەسەر بێت) توانای تکاکردنیان هەیە .

١٠. فریشتەکان توانای تکاکردنیان هەیە .

١١. شەهیدەکان توانای تکاکردنیان هەیە .

١٢. پاداشتی قورئان توانای تکاکردنی هەیە .

١٣. منداڵێك کە پێش خۆ نەناسی (بالغبوونی) مردبێت تکا بۆ دایك وباوکی دەکات.

١٤. زانایان توانای تکاکردنیان هەیە .

١٥. تکاکردن دوای موڵەتدانی خوای پەروەردگار دەکرێت.

## الحديث الرابع : فەرموودەی چوارەم

عَنْ أَبِي مُوسَى(رضي الله عنه)، عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم)، قَالَ « مَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرآنَ كَمَثَلِ الْأُتْرُجَّةِ، رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا طَيِّبٌ،وَمَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي لا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ التَّمْرَةِ، لا رِيحَ لَهَا وَطَعْمُهَا حُلْوٌ،وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الرَّيْحَانَةِ، رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا مُرٌّ،وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِي لَا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الْحَنْظَلَةِ، لَيس لَهَا رِيحٌ وَطَعْمُهَا مُرٌّ ».

ئەبو موسای ئەشعەری (خودا لێی ڕازی بێت)فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا (درودوسەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی : (( نموونەی ئەو بڕوادارەی کە قورئان دەخوێنێ و پەیڕەوی دەکات وەك نارنج وایە ، هەم بۆنی خۆشە و هەم تامی خۆشە ،وە نمونەی ئەو بڕوادارەی کە قورئان ناخوێنێ بەڵام پەیڕەوی دەکات وەك خورما وایە ، هەر چەند بۆنی نیە ، بەڵام تامی خۆشە ،وە نمونەی ئەو دووڕووەی کە قورئان دەخوێنێ وەك ڕەیحانە وایە ، هەرچەندە بۆنی خۆشە بەڵام تامی تاڵە و زەقنەبووتە ،وە نمونەی ئەو دووڕووەی کە قورئان ناخوێنێ وەك گوژارك وایە ، نەبۆنی خۆشە ،تامیشی تاڵ و زەقنەبووتە .

## تەخریج

أخرجه البخاري في كتاب الرقائق،باب:(ذِكْرُ مَثَلِ الْمُؤْمِنِ وَالْفَاجِرِ إِذَا قَرَأَ الْقُرْآنَ)، رقم الحديث: (٧٧٠)(ص٣١٥)،و مسلم في كتاب صلاة المسافرين وقصرها، بَابُ:(فَضِيلَةِ حَافِظِ الْقُرْآنِ)، (رقم الحديث:٢٤٣-(٧٩٧)(ص ٣٥٩)،وأبوداود في كتاب الأدب،باب:(مَن يُؤمَر أن يُجالِس)، (رقم الحديث:٤٨٢٩)،(ص:٧٢٥)،صححه الألباني في صحيح سنن أبي داود (١٨٦/٣)، والنسائي في كتاب الإيمان وشرائعه،باب:(مَثَلُ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ مِنْ مُؤْمِنٍ وَمُنَافِقٍ)،رقم الحديث:٥٠٣٨)،(ص٧٦٥)،صححه الألباني في صحيح سنن النسائي (٣٥٦/٣)، وابن ماجة في كتاب المقدمة، بَابُ:(فَضْلِ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ)(رقم الحديث:٢١٤)(ص٥٤)، صححه الألباني في صحيح سنن ابن ماجة (رقم الحديث:١٧٨)(٨٩/١)،وابن حبان في صحيحه في كتاب الرقائق باب:(ذِكْرُ مَثَلِ الْمُؤْمِنِ وَالْفَاجِرِ إِذَا قَرَأَ الْقُرْآنَ) (رقم الحديث:٧٧٠)، (ص٣١٥)،والبيهقي في شعب الإيمان،باب:(فِي تَعْظِيمِ القُرْآن)،فَصْلٌ فِي إِدْمَانِ تِلَاوَةِ الْقُرْآنِ " قَالَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ مُثْنِيًا عَلَى مَنْ كَانَ ذَلِكَ مِن دَأْبِهِ) (رقم الحديث:١٨٢١)(١٥٠/٤) قال محققه الدكتور:عبدالعلي عبدالحميد حامد:(إسناد رجاله ثقات)،والنسائي في السنن الكبرى في كتاب الوليمة باب:(الْأُتْرُجُّ)،(رقم الحديث: ٦٦٩٩) (٢٥٣/٦)، والدارمي في كتاب فضائل القرآن، بَابُ: مَثَلِ الْمُؤْمِنِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ) (رقم الحديث:٣٢٤٠)(٩٠٠/٢)،وابن أبي شيبة في كتاب فضائل القرآن باب:(فِي مِثْلِ مَنْ جَمَعَ الْقُرْآنَ وَالْإِيمَانَ) (رقم الحديث:٣٠١٦٣) (١٤٣/٦)، وأبو يعلي الموصلي في مسنده في حديث أبي موسى الأشعري،(رقم الحديث:٧٢٠١)(٢٠١/٦)، والبغوي في شرح السنة في كتاب فضائل القرآن بَابُ فَضْلِ تِلاوَةِ الْقُرْآنِ) (رقم الحديث: ١١٧٥)(٢٣٦/٣).





## کورتەی ژیانی ئەبو  موسای ئەشعەری( خوا لێی ڕازی بێت )

ناوی عەبدوڵڵای کوڕی قەیسی کوڕی سولەیمە، هاوەڵی پێغەمبەرە(درودو سەلامی خوای لە سەر بێت)،نیشتەجێبوونی لە بەسرەو لە کوفە بووە،٣٦٠ فەرمودەی لە پێغەمبەر(درودو سەلامی خوای لەسەر بێت) گێڕاوەتەوە،٣٠ فەرمودەی هەردوو پێشەوا بوخاری وموسلیم بەیەکەوە گێڕاویانەتەوە ،وە پێشەوا بوخاری چوار فەرمودەی بە تەنیا گێڕاوەتەوە کە موسلیم نەگێڕاوەتەوە ،وە پێشەوا موسلیمیش پازدە فەرمودەی بە تەنیا گێڕاوەتەوە کە بوخاری نەیگێڕاوەتەوە، وە لەساڵی چل و دووی کۆچی وەفاتی کردووە.

## سوودو پەندەکان

١. نمونەی بڕواداری قورئانخوێن بە نارنج چوێندراوە ، چونکە نارنج بۆن وتامی خۆشە .
٢. ناوهێنانی نارنج .
٣. فەزڵی بڕوادار .
٤. فەزڵی قورئانخوێن.

٥. هاوڕێ یەتی بڕواردار بە تایبەت ئەگەر بەردەوام قوڕئانی دەخوێند.

٦. نمونەی بڕوادار کە قورئان ناخوێنێت بە خورما چوێندراوە ، چونکە خورما تامی خۆشە وبۆنی نیە ، کەواتە کاتێک بۆنت خۆش دەبێت ، کە قورئان بخوێنیت وە لەگەڵی ئاشنا بیت .

٧. ناوهێنانی خورما .

٨. سەرزەنشتکردنی وازهێنەری خوێندنی قوڕئان.

٩. نمونەی دووڕوو کە قورئان دەخوێنێت بە ڕەیحانە چوێندراوە ، چونکە بۆنی خۆشە ، بەڵام بێ تامە ، کاتێک تامت خۆش دەبێت کاتێك ڕۆشنایی باوەڕ بچێتە ناواخنی دڵتەوە .

١٠. ناوهێنانی ڕەیحانە .

١١. دووڕوو سوود لە خوێندنەوەی قوڕئان نابینێت.

١٢. دوورکەوتنەوە لە دووڕوو .

١٣. نمونەی دووڕوو کە قورئان ناخوێنێت بە گوژارك چوێندراوە ، چونکە گوژارك بۆنی نیە ، وتامیشی زەقنەبووتە .

١٤. ناوهێنانی گوژارك.

١٥. دوڕوو زەرەری هەیە نەوەك سوودگەیاندن.

١٦. خۆپاراستن لە هاوڕێ یەتی دووڕوو.

# الحديث الخامس : فەرموودەی پێنجەم

عَنْ عَائشَةَ رضي الله عنها ) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ(ﷺ ):"الْمَاهِـرُ بِالْقُرْآنِ مَعَ السَّفَرَةِ الْكِرَامِ الْبَرَرَةِ، وَالَّذِي يَقْرَأُ يَتَتَعْتَعُ فِيهِ وَهُوَ عَلَيْـهِ شَاقٌّ ، لَهُ أَجْرَانِ اثْنَانِ"

دایە عائیشە هاوسەری پێغەمبەر (دروودو سەلامی خوای لەسەر بێت) وڕەزای خوا لەسەر هەموو هاوەڵ و هاوسەرانی ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا (دروودو سەلامی خوای لەسەر بێت)فەرموویەتی: نموونەی ئەو قورئانخوێنەی کە بە ڕەوانی قورئان دەخوێنێتەوە، وکارو ڕەفتارو پەیڕەوی پێ دەکات، لە پلەی فریشتە ڕێزدارو چاکە خوازانەدایە، نموونەی ئەو قورئانخوێنەی کە خەریکە قورئان دەخوێنێتەوە و بەگرانی بۆی دێتە سەر زوبانی، چونکە زوبانی پێوە تەتەڵە دەکات، ئەم جۆرە کەسەش لە جیاتی یەك پاداشت ، دوو پاداشت وەردەگرن

## تەخریج

أخرجـــه البخـــاري في كتـــاب التفســـير باب:( ســـورة عَـــبَسَ ، رقم الحديث:٤٩٣٧)(ص١٢٧٢)، ومسلم في كتاب صلاة المسافرين وقصرها، بَابُ:( فَضْلِ الْمَاهِرِ فِي الْقُرْآنِ،وَالَّذِي يَتَتَعْتَعُ فِيهِ ، رقم الحديث:(٢٤٤-(٧٩٨)،( ص٣٥٩) ، وأبو داود في كتاب الصلاة ، باب:(تفريع أبواب الوتر)(باب: فِي ثَوابِ قِراءَةِ القُرْآن) رقم الحديث:١٤٥٤)(ص٢٢٥)، وصححه الألباني في صحيح سنن أبي داود (٤٠٠/١)، والترمذي في كتاب ثواب القرآن، بَابُ:(مَا جَاءَ فِي فَضْلِ قَارِئِ القُرْآنِ)(رقم الحديث:٢٩٠٤)(ص٦٤٩)،وقال أبو عيسى الترمذي: هذا حديث حسن صحيح، وصححه الألباني في صحيح سنن الترمذي (١٦٢/٣)،وابن ماجة في كتاب الأدب، بَابُ:(ثَوَابِ الْقُرْآنِ)،(رقم الحديث:٣٧٧٩)،(ص٦٢٣).صححه الألباني في صحيح سنن ابن ماجة رقم الحديث:٣٠٦١) (٢٣٨/٣)، والنسائي في سنن الكبرى في كتاب فضائل القرآن ، باب:(الْمَاهِرُ بِالْقُرْآنِ)،(رقم الحديث:٧٩٩١) (٢٦٩/٧) ، وعبدالرزاق الصنعاني في المصنف بَابُ:(التَّرْتِيلِ فِي الْقُرْآنِ)،(رقم الحديث:٦٠٣٦)(٢٣٠/٣)، والبيهقي في شعب الإيمان في باب:( في تَعْظِيمِ القُرْآن)، فَصْلٌ:(فِي إِدْمَانِ تِلَاوَةِ الْقُرْآنِ)،(رقم الحديث:١٨٢٢)(١٥٢/٤) قال محققه الدكتور:عبدالعلي عبدالحميد حامد:(إسناده صحيح ورجاله ثقات)، وفي السنن الكبرى في كتاب الصلاة بَابُ:(الْمُعَاهَدَةِ عَلَى قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ)، رقم الحديث:٤١١٢)(٢٩/٥)، وابن حبان في كتاب الرقائق باب:(ذِكْرُ تَفَضُّلِ اللَّهِ جَلَّ وَعَلَا عَلَى الْمَاهِرِ بِالْقُرْآنِ بِكَوْنِهِ مَعَ السَّفَرَةِ، وَعَلَى مَنْ يَصْعُبُ عَلَيْهِ قِرَاءَتُهُ بِتَضْعِيفِ الْأَجْرِ لَهُ)،(رقم الحديث:٧٦٧)(ص٣١٤)،وابن أبي شيبة في كتاب فضائل القرآن في باب:(الْمَاهِرِ بِالْقُرْآنِ)،(رقم الحديث:٣٠٠٣٦) (١٢٨/٦) ،والبغوي في شرح السنة في كتاب فضائل القرآن بَابُ:(فَضْلِ تِلاوَةِ الْقُرْآنِ)،(رقم الحديث:١١٧٣)(٢٣٥/٣)، والدارمي في كتاب فضائل القرآن، بَابُ:(فَضْلِ مَنْ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَيَشْتَدُّ عَلَيْهِ ) رقم الحديث:( (٣٢٤٥)(٩٠١/٢)

# ژیانی دایکی بڕواداران عائیشه( خوا لێی ڕازی بێت )

عائیشـــه(خوا لێــی ڕازی بێــت)دایکی بــڕواداران کچــی پێشـــەوا ئەبوبەکری سدیق، پێش کۆچـی پێغەمبـەر (درووودو سـەلامی خـوای لەسـەر بێـت) بـە نـۆ سـاڵ لـە دایـك بـووە، وە خێزانـی پێغەمبـەر (درووودو سـەلامی خـوای لەسـەر بێـت)بوو، بەشـداری کـردووە لـە جەنگی ئوحود کە جەوەندەی بۆ سـەربازەکان پـڕ ئـاو دەکـرد،دوو هـەزار وچوارسـەدو دوو فـەرموودەی لـە پێغەمبـەر(درووودو سـەلامی خوای لەسەر بێت) گێڕاوەتەوە، ١٧٤ فـەرموودەی هـەردوو پێشـەوا بوخاری وموسلیم بەیەکەوە گێڕاویانەتـەوە،وە پێشـەوا بوخـاری ٥٤ فەرمودەی بە تەنیا گێڕاوەتەوە کە پێشەوا موسلیم نەیگێڕاوەتەوە، وە پێشـــەوا موسـلیم ٦٩ فــەرمودەی بــە تــەنیا گێڕاوەتــەوە، کــە پێشەوا بوخاری نەیگێڕاوەتەوە،وە لە سـاڵی پەنجاوهەشـتی کۆچـی وەفاتی کردووە

# سوودو پەندەکان

١. هەر کەسێك قورئان زۆر بە جوانی بخوێنێتەوە، مافی پیتەکان بە جوانی بدات، وە مەخاریجەکانی بە جوانی دەربکات،واتە بە تەجویدێکی ڕەوان بخوێنێتەوە وکاری پێ بکات ، دەچێتە ڕیـز فریشتە بەڕێزەکان .

٢. هەر کەسێك قورئان بە قورسی بخوێنێتەوە ، بە گرانی لەسـەر زاری دەربچێت ، ئەمەش دوو پاداشتی هەیە .

٣. فەزڵی تەجوید .

٤. چەند زیـاتر لـە سـەر زمـانی قورسـتر بێـت ئەوەنـدە پاداشـتی زیاترە .

## الحديث السادس : فەرموودەی شەشەم

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): "أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ إِذَا رَجَعَ إِلَى أَهْلِهِ، أَنْ يَجِدَ فِيهِ ثَلَاثَ خَلِفَاتٍ عِظَامٍ سِمَانٍ؟" قُلْنَا: نَعَمْ. قَالَ: "فَثَلَاثُ آيَاتٍ يَقْرَؤُهُنَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاتِهِ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ ثَلَاثِ خَلِفَاتٍ سِمَانٍ عِظَامٍ"

ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێت):دەگێڕتەوە کە پێغەمبەری خوا(درودو سەلامی خوای لەسەر بێت)فەرموویەتی:ئایا پێتان خۆشە بگەڕێنەوە ناو خانەوادەکانتان وسێ حوشتری ئاووسی گەورەی زل لە ماڵەکانتان دا ببینن،ئێمەش ووتمان:بەڵێ پێمانخۆشە،فەرمووی:دەی خوێندنەوەی سێ ئایەت لە ناو نوێژ زۆر چاکتر و خێرترە لە سێ حوشتری ئاوسی گەورەی زل

## تەخریج

أخرجه مسلم في كتاب صلاة المسافرين و صرها ، بَابُ : فَضْلِ قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ فِي الصَّلَاةِ وَتَعَلُّمِ ) ، (رقم الحديث ٨٠٢ )،(ص ٦١ )،وابن ماجة في كتاب الأدب بَابُ : ثَوَابِ الْقُرْآنِ )، رقم الحديث ٣٧٨٢ ) (ص ٢٤ )،وصححه الألباني في صحيح سنن ابن ماجة رقم الحديث ٣٠٦٤ ) ٣٩ ) ،والدارمي في كتاب فضائل القرآن بَابُ فَضْلِ مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ ) ،(رقم الحديث ١٩٦ ) ٨٩ ) ، وابن أبي شيبة في كتاب فضائل القرآن ،باب:( فِيمَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَ )(رقم الحديث ٣٠٠٦٥ ) ٣٣ )،والبيهقي في شعب الإيمان في باب:(في تعظيم القرآن) (فصل:في استحب ب القراءة في الصلاة)(رقم الحديث ٢٠٤٨ ) ٤٩ )، والبغوي في شرح السنة في كتاب فضائل القرآن بَابُ فَضْلِ تِلاوَةِ الْقُرْآنِ )(رقم الحديث ١١٧٧ ) ٣٨ )

## سوودو پەندەکان

١. فەزڵی خوێندنەوەی قورئان لە ناو نوێژ .

٢. خوێندنەوەی قورئان لە ناو نوێژ پاداشتی یەکجار زۆرترە لە خوێندنەوەی قورئان لە غەیری نوێژدا.

٣. فەزڵی خوێندنەوەی قورئان لە ناو مزگەوت .

٤. خویندنەوەوەی ئایەتێك لە ناو نوێژ خێرو فەزڵی زیاترە لە حوشترێکی ئاوسی گەورەی زل.

٥. خویندنەوەوەی دوو ئایەت لە ناو نوێژ خێرو فەزڵی زیاترە لە دوو حوشتری ئاوسی گەورەی زل.

٦. خویندنەوەوەی سێ ئایەت لە ناو نوێژ خێرو فەزڵی زیاترە لە سێ حوشتری ئاوسی گەورەی زل.

٧. چەند زیاتر لە ناو نوێژ ئایەتی زیاتر بخوێنی ئەوەندە چاکتر و باشترە ، بە گوێرەی زیادبوونی ئایەتەکان حوشترەکان زیاتر دەبێت .

٨. داواکردنی فێربوونی قورئان زۆر زیاترە لە داواکردنی ماڵ و سامان بە فیڕۆنەدانی کاتی بەتاڵ ، بە پڕکردنەوەی بە فێربوون یان فێرکردنی قورئان .

٩. فەزڵی وەرگرتنی زانستی شەرعی بە تایبەت ئەگەر لە مزگەوت بێت .

## الحديث السابع : فەرموودەی حەوتەم

عَنِ النَّوَّاسِ بْنِ سَمْعَانَ(ﷺ)، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: " يُؤْتَى بِالْقُرْآنِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَأَهْلِهِ الَّذِينَ كَانُوا يَعْمَلُونَ بِهِ تَقْدُمُهُمْ سُورَةُ الْبَقَرَةِ وَآلِ عِمْرَانَ " وَضَرَبَ لَهُمَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) ثَلاثَةَ أَمْثَالٍ مَا نَسِيتُهُنَّ بَعْدُ قَالَ: " كَأَنَّهُمَا غَمَامَتَانِ، أَوْ ظُلَّتَانِ سَوْدَاوَانِ بَيْنَهُمَا شَرْقٌ، أَوْ كَأَنَّهُمَا فِرْقَانِ مِنْ طَيْرٍ صَوَافَّ يُحَاجَّانِ عَنْ صَاحِبِهِمَا "

نەواسی کوڕی سەمعان(خوا لێی ڕازی بێت)دەفەرموێ :کە گوێی لە پێغەمبەری خوا (درودو سەلامی خوای لەسەر بێت)فەرموویەتی:لە ڕۆژی قیامەتدا قورئان وخاوەنەکانیان کە پەیڕەوی قورئانیان کردوە دەهێنرێن ،وە هەردوو سورەتی بەقەرە و ئال عیمران پێشیان دەکەون،وە پێغەمبەری خوا(درودو سەلامی خوایان لەسەر بێت) بە سێ شێواز شوبهاندنی کە هیچیانم لە بیر نەکردوون،شوبهاندنی یەکەم ئەو دوو سورەتە وەك دوو پەڵە هەور داپۆشتبوون ، شوبهاندنی دووەم: یان وەك دوو چەتری ڕەش پۆشتەیان لێ کردبوو رۆژهەڵات لە نێوانیان بوو، شوبهاندنی سێهەم:یان وەکو دوو پۆڵە چۆلەکەی ریزکراو پاڵپشتی دەکەن لە خاوەنەکەیان کە پەیڕەوی قورئانی پیرۆزیان کردبوو .

## تەخریج

أخرجه مسلم في كتاب صلاة المسافرين وقصرها ،بَابُ :(فَضْلِ قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ، وَسُورَةِ الْبَقَرَةِ)(رقم الحديث:٢٥٢-(٨٠٤)،( ص٣٦٢)،والترمذي في كتاب:ثوابُ القرآن)،بَابُ:(مَا جَاءَ فِي سُورَةِ آلِ عِمْرَانَ ) (رقم الحديث:٢٨٨٣) (ص٦٤٤)وصححه الألباني في صحيح سنن الترمذي (١٥٤/٣)،وابن حبان في صحيحه في كتاب العلم باب:( ذِكْرُ الْحَثِّ عَلَى تَعْلِيمِ كِتَابِ اللَّهِ، وَإِنْ لَمْ يَتَعَلَّمِ الْإِنْسَانُ بِالتَّمَامِ) (رقم الحديث:١١٦) (ص١٤٤)،وأحمد في مسنده في مسند أبي أمامة الباهلي ،(رقم الحديث:٢٢٢١٣) (٥٤٦/٣٦) وقال المحققون:حديث صحيح .والدارمي في كتاب فضائل القرآن،بَابُ:(فِي فَضْلِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ وَآلِ عِمْرَانَ)(رقم الحديث :٦٢٦٨) (٩٠٧/٢)، والبيهقي في شعب الإيمان بابٌ:(فِي تَعْظِيمِ الْقُرْآنِ)،فَصْلٌ:(فِي ذِكْرِ سُورَةِ البَقَرَةِ وآلِ عِمْرانِ )(رقم الحديث:

٢١٥٦) (٤٤٤/٤) ،والبيهقي في السنن الصغير في كتاب فضائل القرآن،بَابٌ:(فِي فَضْلِ الْقُرْآنِ وَتَخْصِيصِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ وَآلِ عِمْرَانَ بِالذِّكْرِ)،(رقم الحديث:٤٦٧ )، (٢٧٠/١) .،والبيهقي في السنن الكبير في كتاب الصلاة بَابُ:(الْمُعَاهَدَةِ عَلَى قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ (رقم الحديث:(٤١١٣)(٢٩/٥)، والبغوي في شرح السنة في كتاب فضائل القرآن بَابُ:(فَضْلِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ وَآلِ عِمْرَانَ)(رقم الحديث:١١٩٠)(٢٤٨/٣)،وعبدالرزاق الصنعاني في مصنفه في كتاب فضائل القرآن بَابُ تَعْلِيمِ الْقُرْآنِ وَفَضْلِهِ)(رقم الحديث: ٦٠١٠)(٢٢٣/٣)

## کورتەیەك لە ژیانی نەواسی کوڕی سەمعان( خوا لێی ڕازی بێت )

**نەواسی کوڕی سەمعانی کیلابیە ، هاوەڵی پێغەمبەرە (درودو سەلامی خوای لەسەر بێت)، جێنشینی لە شام بووە ، حەڤدە فەرمودەی لە پێغەمبەر(درودو سەلامی خوای لەسەر بێت) گێڕاوەتەوە، لە ساڵی ٥٠ ی کۆچی وەفاتی کردووە.**

## سوودو پەندەکان

**١. پاداشتی قورئان تکاکارە لە ناوگۆڕ و لە رۆژی دوامایی .**

٢. فەزڵی دوو سوڕەتی ئال عیمران و بەقـەرە کـە بـە زەهـراوەین ناونراوە .

٣. فەزڵی کارکردن و پەیڕەوی کردنی قورئان کە دەبێتە تکاکار .

٤. ئــەم دوو ســورەتە دەبنــە دوو پەلــە هــەور خاوەنــەکانیان دادەپۆشن.

٥. ئەم دوو سورەتە دەبنە دوو چەتر خاوەنەکانیان دادەپۆشن.

٦. ئەم دوو سورەتە دەبنە دوو پۆلە چۆلەکەی ڕیزکراو پاڵپشـتی دەکەن لە پەیڕەوانی قورئان .

# الحديث الثامن: فەرموودەی هەشتەم

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ)،أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ)قَالَ:"لا تَجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ مَقَابِرَ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَفِرُّ مِنَ الْبَيْتِ الَّذِي يُقْرَأُ فِيهِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ "

**ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕتەوە ،کە پێغەمبەری خوا (دروودو سەلامی خوای لە سەر بێت) فەرموویەتی ((ماڵەکانتان مەکەن بە گۆڕستان، چونکە شەیتان لە ماڵێك ڕادەکات کە سورەتی بەقەرەی تیا بخوێندرێت)**

## تەخریج

أخرجه مسلم في كتاب صلاة المسافرين وقصرها، بَابُ: (اسْتِحْبَابِ صَلَاةِ النَّافِلَةِ فِي بَيْتِهِ، وَجَوَازِهَا فِي الْمَسْجِدِ) (رقم الحديث:٢١٢-(٧٨٠)(ص٣٥٣) ، والترمذي في كتاب:(أَبْوَابُ ثَوَابِ الْقُرْآنِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) ، بَابُ:(مَا جَاءَ فِي فَضْلِ سُورَةِ البَقَرَةِ وَآيَةِ الكُرْسِيِّ )، (رقم الحديث:٢٨٨٧)(ص٦٤٣)وقال الترمذي:هذا حديث حسن صحيح ،وصححه الألباني في صحيح سنن الترمذي :(١٥٢/٣)،وأحمد في مسنده في مسند أبي هريرة (رضي الله عنه)،(رقم الحديث: ٧٨٢٢)(٢٢٤/١٣)،والنسائي في السنن الكبرى في كتاب فضائل القرآن، باب:( سُورَةُ الْبَقَرَةِ) (رقم الحديث:٧٩٦١)(٢٥٧/٧)،والبيهقي في شعب الإيمان باب:(في تعظيم القرآن) ، فَصْلٌ:( ذِكْرُ سُورَةِ الْبَقَرَةِ، وَآلِ عِمْرَانَ ،(رقم الحديث:٢١٦٤) ، (٤٤٩/٤)،وفي السنن الصغير في كتاب فضائل القرآن بَابٌ فِي فَضْلِ الْقُرْآنِ وَتَخْصِيصِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ وَآلِ عِمْرَانَ بِالذِّكْرِ)

(رقم الحـديث:٩٧٣)(٢٧٠/١)، وعبـدالرزاق الصـنعاني في كتـاب الصلاة بَابُ:(اتِّخَـاذِ الرَّجُلِ فِي بَيْتِهِ مَسْجِدًا، وَالصَّلَاةِ ) (رقم الحديث:١٥٣٥)(٢٩٩/١)، والبغوي في شرح السـنة في كتـاب فضـائل القـرآن، بَابُ:(فَضْـلِ سُـورَةِ الْبَقَـرَةِ وَآلِ عِمْـرَانَ)، (رقم الحديث:١١٩٣)(٢٥٠/٣)، وابن حبان في صحيحه في كتاب الرقائق ،باب:(ذِكْرُ فِرَارِ الشَّيْطَانِ مِنَ الْبَيْتِ إِذَا قُرِئَ فِيهِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ) (رقم الحديث:٧٨٣)(ص٣١٩)



## سوودو پەندەکان

١. گۆڕستان شوێنی قورئان خوێندن نیە .

٢. گۆڕستان شوێنی نوێژکردن نی یە .

٣. نابێت ماڵ وەك گۆڕستانی لێ بکرێت قورئـانی لێ نەخوێنـدرێت ، چونکە گۆڕستان شوێنی قورئان خوێنـدن نیـە، بـەڵکو مـاڵ شوێنی قورئان خوێندنە.

٤. فەزڵ و گەورەیی خوێندنەوەی سوڕەتی البقرە .

٥. شەیتان بە خوێندنەوەی سورەتی البقرە ڕادەکات .

٦. شەیتان بە خوێندنەوەی هەموو قوڕئان پەست دەبێت بـەڵام بە سورەتی البقـرە زیـاتر لێـی پەسـت دەبێـت وزیـاتر لێـی ڕا دەکات .

٧. **شەیتان لە دوژمنە هەرە سەرسەختەکانی مرۆڤە ، هەر کاتێک مرۆڤ بێ ئاگا بوو لە یادی خوا ، شەیتان دەسەلاتی بەسەر دلێدا دەگرێت ، و وەسوەسەی بۆ دروست دەکات** ﴿ وَمَن يَعۡشُ عَن ذِكۡرِ ٱلرَّحۡمَٰنِ نُقَيِّضۡ لَهُۥ شَيۡطَٰنٗا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٞ ٣٦ وَإِنَّهُمۡ لَيَصُدُّونَهُمۡ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَيَحۡسَبُونَ أَنَّهُم مُّهۡتَدُونَ ٣٧ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَنَا قَالَ يَٰلَيۡتَ بَيۡنِي وَبَيۡنَكَ بُعۡدَ ٱلۡمَشۡرِقَيۡنِ فَبِئۡسَ ٱلۡقَرِينُ ٣٨ ﴾ **الزخرف: ٣٦ – ٣٨**

٨. **دوورخستنەوەی شەیتان بە یادی خوا دەکرێت ، وە یادی خواش نوێژ و خوێندنەوەی قورئان و زیکرەکان ، وبانگدان و هەموو پەرستشەکان .**

٩. **ئەنجامدانی نوێژی سوننەت لە ماڵەوە.**

١٠. **ئەنجامدانی نوێژی فەرز لە مزگەوت .**

## الحديث التاسع: فەرموودەی نۆیەم

عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الجُهَنِيِّ (رضي الله عنه) قالَ:قالَ رَسُولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم): « الْجَاهِرُ بِالْقُرْآنِ كَالْجَاهِرِ بِالصَّدَقَةِ، وَالْمُسِرُّ بِالْقُرْآنِ كَالْمُسِرِّ بِالصَّدَقَةِ ».

**عوقبەی کوڕی عامری جوهەنی(خوا لێی ڕازی بێت) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: هەر کەسێك قورئان بە ئاشکرا بخوێنێتەوە ، وەك ئەوە وایە خێرێك بە ئاشکرا ببەخشێت ، وە هەر کەسێك قورئان بە پەنهانی بخوێنێتەوە ، وەك ئەوە وایە خێرێك بە پەنهانی ببەخشێت ))**

## تەخریج

أخرجه أبو داود في كتاب الصلاة ، بَابٌ:(فِي رَفْعِ الصَّوْتِ بِالْقِرَاءَةِ فِي صَلاةِ اللَّيْلِ )، (رقم الحديث:١٣٣٣)(ص:٢٠٧)،وصححه الألباني في صحيح سنن أبي داود(١/٣٦٥)والنسائي في كتاب الزكاة ، بَابُ:(الْمُسِرِّ بِالصَّدَقَةِ)، (رقم الحديث:٢٥٦١)(ص٣٩٩)، وصححه الألباني في صحيح سنن النسائي :(٢/٢١٥)، والترمذي في كتاب ثوابِ القُرآنِ عن رسول الله (صلى الله عليه وسلم)، (رقم الحديث :٢٩١٩)،(ص:٦٥٣)، وصححه الألباني في صحيح سنن الترمذي (٣/١٦٦)، والنسائي في السنن الكبرى في كتاب الزكاة باب:(الْمُسِرِّ بِالصَّدَقَةِ )،(رقم الحديث: (٢٣٥٣)

(٦٣/٣)،والبيهقي في شعب الإيمان في باب:(فِي تَعْظِيمِ الْقُرآنِ)، فَصْلٌ:(فِي رَفْعِ الصَّوْتِ بِالْقُرْآنِ إِذَا لَمْ يَتَأَذَّ بِهِ أَصْحَابُهُ أَوْ كَانَ وَحْدَهُ أَوْ كَانُوا يَسْتَمِعُونَ لَهُ)،(رقم الحديث :٢٣٧٢)(٦٦/٥) ، وفي السنن الكبير في كتاب الصلاة باب:(بابُ مَن جَهَرَ بها إذا كان مَن حَولَه لا يَتأَذَّى بقِراءَتِهِ) (رقم الحديث: (٤٧٧٤)(٣٨١/٥)،وأحمد في المسند في مسند عقبة بن عامر (رضي الله عنه)(رقم الحديث:١٧٣٦٨) (٥٩٨/٢٨)،والبخاري في (خلق أفعال العباد) (رقم الحديث: (٥٦٧)،وابن حبان في صحيحه في كتاب الرقائق باب:(ذِكْرُ الْبَيَانِ بِأَنَّ قِرَاءَةَ الْمَرْءِ الْقُرْآنَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ نَفْسِهِ تَكُونُ أَفْضَلَ مِنْ قِرَاءَتِهِ بِحَيْثُ يُسْمَعُ صَوْتُهُ) (رقم الحديث: (٧٣٤)(ص٣٠٦)



## عوقبەی کوڕی عامری جوهەنی ( خوا لێی ڕازی بێت )

عوقبەی کوڕی عامری کوڕی عەبسی جوهەنی یە(خوا لێی ڕازی بێت)، یەکێك بوو لە موقریئەکان کە قورئانیان کۆکردەوە ، (٥٥) فەرمودەی لە پێغەمبەر (درودو سەلامی خوای لەسەر بێت) گێڕاوەتەوە ، لە ساڵی ٥٨ ی کۆچی وەفاتی کردووە .

## سوودو پەندەکان

١. قورئان خوێندن بە ئاشکرا وەك بەخشینی ماڵ بە ئاشکرا وایە ، ئەمە بۆ ئەو کەسەی کە لە ڕیا بترسێت، بەڵام ئەگەر لە ڕیا نەترسا ئەوا ئاساییە قورئان بە ئاشکرا بخوێنێت، یان ئەگەر

لــە كــاتی شــەونوێژكردن بــوو وە دەوروبــەری خــەڵكانێك نوستبوون ئەوسا بەو قورئانخوێندنەی بە ئاشكرا دەوروبـەری ئەزیەت دەدات .

٢. ئەگەر لە كاتی شەونوێژكردن بوو وە بە تەنیا بوو ، كـەس لـە دەوروبـەری نـەبوو ئەوسـا بـەو قورئانخوێندنـەی بـە ئاشـكرا دەوروبەری ئەزیەت نادات .

٣. بەخشین بە ئاشـكرا لـە ڕیـا نزیكـە ، بـەڵام ئەگـەر یـەكێك بـە ئاشكرا ببەخشێت بۆ ئەوەی خـەڵكی چـاوی لـێ بكـەن ، ئـەوا ئاساییە و ڕێگە پێدراوە .

٤. قورئــان خوێنــدن بــە پــەنهانی وەك بەخشــینە بــە پــەنهانی، چونكە پەنهانی دوورترە لە ڕیا ، ئەگـەر ترسـا بكەوێتـە ڕیـا ، ئەوا با قورئان بە پەنهانی بخوێنێت

٥. ئــەو كەســەی قورئــان بــە پــەنهانی دەخوێنــێ چــاكترە لــەو كەسەی كە بـە ئاشـكرا و لـە نـاو خـەڵكی قوڕئـان دەخوێنـێ، چونكە پارێزراو دەبێت لە عوجب وكەیف بەخۆ هاتن

# الحديث العاشر: فەرمووەدەی دەیەم

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (ﷺ)، قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ(ﷺ): اقْرَأْ عَلَيَّ الْقُرْآنَ ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ، أَقْرَأُ عَلَيْكَ وَعَلَيْكَ أُنْزِلَ؟ قَالَ: إِنِّي أَشْتَهِي أَنْ أَسْمَعَهُ مِنْ غَيْرِي ، قَالَ: فَقَرَأْتُ النِّسَاءَ حَتَّى إِذَا بَلَغْتُ ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا﴾ [النساء ٤١] رَفَعْتُ رَأْسِي أَوْ غَمَزَنِي رَجُلٌ إِلَى جَنْبِي فَرَأَيْتُ دُمُوعَهُ تَسِيلُ).

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود(خوا لێی ڕازی بێت)فەرمووی:پێغەمبەر (دروودو سەلامی خوای لە سەر بێت)فەرمووی:هەندێ قورئانم بەسەردا بخوێنە، گۆتم: قوربان! قورئان بەسەر تۆدا دابەزیوە، چۆن من لەسەر تۆدا بخوێنم ؟!، پێغەمبەر (دروودو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرمووی:حەز دەکەم کەسێکی تر لەسەرم بخوێنێت، وە منیش گوێی لێی بگرم ، منیش سورەتی نیسائم بۆی خوێند تا گەیشتمە ئایەتی ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾ ﴾ ﴿النساء: ٤١﴾ ،عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (خوا لێی ڕازی بێت)فەرمووی :کە سەرم هەڵبڕی تەماشام کرد،

**پێغەمبەر (دروودو سەلامی خوای لەسەر بێت)هۆن هۆن فرمێسك بە چاوە موبارەکەکانی دەهاتە خوارەوە .**

## تەخریج

أخرجه البخاري في كتاب التفسير بَابُ :﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾ ﴾ [النساء: ٤١]، (رقم الحديث:٤٥٨٢)، (ص١١٣٨)،ومسلم في كتاب صلاة المسافرين وقصرها،بَابُ:(فَضْلِ اسْتِمَاعِ الْقُرْآنِ،وَطَلَبِ الْقِرَاءَةِ مِنْ حَافِظِهِ لِلِاسْتِمَاعِ وَالْبُكَاءِ عِنْدَ الْقِرَاءَةِ وَالتَّدَبُّرِ)،(رقم الحديث:٢٤٧-(٨٠٠)،(ص٣٦٠)،وأبو داود في كتاب العلم،بَابٌ:(فِي الْقَصَصِ) ،(رقم الحديث:٣٦٦٨)، (ص٥٥٥)، وصححه الألباني في صحيح سنن أبي داود(٤١٣/٢)، والترمذي في كتاب تفسير القرآن عن رسول الله(ﷺ)، بَابٌ:(وَمِنْ سُورَةِ النِّسَاءِ)،(رقم الحديث :٣٠٢٥) ،(ص٦٧٦)، وصححه الألباني في صحيح سنن الترمذي(٢١٧/٣)،وابن ماجة في كتاب الزهد باب:(الحزن والبكاء)،(رقم الحديث:٤١٩٤)،(ص٦٩٦)، وصححه الألباني في صحيح سنن ابن ماجة (٣٦٩/٣)،والنسائي في السنن الكبرى كتاب فضائل القرآن باب:(مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَسْمَعَ الْقُرْآنَ مِنْ غَيْرِهِ)،(رقم الحديث:٨٠٢١) ،(٢٨١/٤)، وأحمد في مسنده في مسند عبدالله بن مسعود(رضي الله عنه)،(رقم الحديث:٤١١٨)(١٩٠/٧)،والبيهقي في شعب الإيمان في (بَابٌ فِي الْخَوْفِ مِنَ اللهِ تَعَالَى)(رقم الحديث:٧٥٥)(٤٤٥/٢)، وابن أبي شيبة في مصنفه في كتاب فضائل القرآن ، بابٌ:(فِي قِرَاءَةِ النَّبِيِّ (ﷺ)عَلَى غَيْرِهِ)(رقم الحديث:٣٠٢٩٤) (١٥٥/٦)

# سوودو پەندەكان

١. یەكێك قورئانت بەسەردا بخوێنیّ كاریگـەری زۆر زیـاترە لـەوەی خۆت قورئان بۆ خۆت بخوێنیت .

٢. ئەگـەر پـێغەمبـەری خـوا (دروودو سـەلامی خـوای لەسـەر بێـت) داوای لە غەیری خـۆی كردبێـت قورئـانی بەسـەردا بخوێنرێـت ، غەیری ئەو زۆر ئەولاترە .

٣. پـێغەمبەری خوا (دروودو سەلامی خوای لەسـەر بێت)فـەرمووی: تامەزرۆم قورئانم گویّ لیّ بێت لە غەیری خۆم .

٤. كاریگەری قورئـان لـە سـەر پـێغەمبـەری خـوا (دروودو سـەلامی خوای لەسەر بێت)كە وای لیّ كرد فرمێسـكی موبـارەكی بڕژێتـە خوارەوە .

## الحديث الحادي عشر: فەرموودەی یازدەیەم

عَـنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ (ﷺ) أَنَّ رَسُـولَ اللَّـه (ﷺ) قَـالَ ‹ لاَ حَسَـدَ إِلاَّ فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ عَلَّمَهُ اللَّهُ الْقُرْآنَ؛ فَهُوَ يَـتْلُـوهُ آنَـاءَ اللَّيْـلِ وَآنَـاءَ النَّهَـارِ، فَسَمِعَهُ جَارٌ لَهُ، فَقَالَ: لَيْتَنِـى أُوتِيـتُ مِثْـلَ مَـا أُوتِيَ فُـلاَنٌ، فَعَمِلْـتُ مِثْلَ مَا يَعْمَلُ، وَرَجُلٌ آتَـاهُ اللَّـهُ مَـالاً، فَهْـوَ يُهْلِكُـهُ فِي الْحَـقِّ، فَقَـالَ رَجُلٌ: لَيْتَنِى أُوتِيتُ مِثْلَ مَا أُوتِيَ فُلاَنٌ، فَعَمِلْتُ مِثْلَ مَا يَعْمَلُ".

ئـەبو هـورەیرە (خـوا لێـی ڕازی بێـت) فەرمووی:پێغەمبـەری خوا(درووودو سـەلامی خـوای لەسـەر بێـت) فەرموویەتی:خۆزگـە پـێ بردن بە کـەس دروسـت نیـە بـەم دوو کەسـە نەبێت:کەسـێك خـوای پەروەردگار فێـری قورئـانی کردبێت،ئـەویش درێغـی لـێ نـەکات بـە شـەوو بـە ڕۆژ بیخوێنـێ لـە نوێـژە سـوننەتەکان وغـەیری نوێـژە سوننەتەکان،وە پەیڕەوی بەو قورئانە دەکات ،دراوسێ یەکی گوێی لێ دەبێت، ودەڵێ :خۆزگە دەخوازم منیش وەك ئەو کەسە شـارەزا بـووام لـە قورئـان و پـەیڕەوم بکردبوایـە وەك چۆن ئـەو پـەیڕەوی دەکات .

وە کەسێك کە خوای پەروەردگار ماڵ وسامانێکی زۆری پێ بەخشی بێت ، ئەویش درێغی لێ نەکات وبە ڕاست و چەپدا،وبە شـەو وڕۆژدا

**خێرو چاکە و بەخشینی پێ بکات، وە کەسێك بلێت:خۆزگە منیش وەك ئەو دەوڵەمەندەم هەبوایە تا منیش لێم ببەخشیبوایە ، وەك ئەو کەسە چۆن لێی دەبەخشێ .**

## تەخریج

أخرجه البخاري في كتاب فضائل القرآن ،بَابُ:(اغْتِبَاطِ صَاحِبِ القُرْآنِ)،(رقم الحديث:٥٠٢٦) ،(ص١٢٩٩)،ومسلم في كتاب صلاة المسافرين وقصرها،بَابُ:( فَضْلِ مَنْ يَقُومُ بِالْقُرْآنِ،وَيُعَلِّمُهُ، وَفَضْلِ مَنْ تَعَلَّمَ حِكْمَةً مِنْ فِقْهٍ، أَوْ غَيْرِهِ فَعَمِلَ بِهَا وَعَلَّمَهَا)،(رقم الحديث:(٢٦٨- (٨١٦) ، (ص٣٦٥)،والترمذي في كتاب البر والصلة عن رسول الله (ﷺ)بَابُ:( مَا جَاءَ فِي الحَسَدِ) ، (رقم الحديث:١٩٣٦)،(ص٤٤٢)،قال أبو عيسى: هذا حديث حسن صحيح،وصححه الألباني في صحيح سنن الترمذي(٣٥٥/٢)،وابن ماجة في كتاب الزهد،بَابُ:(الْحَسَدِ)،رقم الحديث :٤٢٠٨)(ص٦٩٨) ، وصححه الألباني في صحيح سنن ابن ماجة(رقم الحديث: ٣٤١٢) (٣٧٢/٣)،والنسائي في السنن الكبرى في كتاب العلم باب:(الِاغْتِبَاطُ فِي الْعِلْمِ) (رقم الحديث :٥٨٠٩) (٣٥٨/٥)،وابن حبان في صحيحه في كتاب العلم،باب:(ذِكْرُ إِبَاحَةِ الْحَسَدِ لِمَنْ أُوتِيَ الْحِكْمَةَ، وَعَلَّمَهَا النَّاسَ) ،(رقم الحديث:٩٠)(ص١٣٧)، والبيهقي في شعب الإيمان في بَابٌ:(فِي تَعْظِيمِ الْقُرْآنِ)، فَصْلُ:(فِي الْحُكْمِ بَيْنَ النَّاسِ) (رقم الحديث: ٧١٢٢) (٢١٤/١١)،وفي السنن الكبرى في كتاب الزكاة بابُ:(وُجوه الصَّدَقَةِ وما على كُلِّ سُلامَى مِنَ النّاسِ مِنها كُلَّ يَومٍ) (رقم الحديث:٧٩٠٢)(٣٦٢/٨)، وفي السنن الصغير في كتاب آداب القاضي باب:(أَدَبُ الْقَاضِي وَفَضْلُهُ) (رقم الحديث:٤٤٧٩)(٤٦٤/٢)، وابن أبي شيبة في كتاب فضائل القرآن، بابُ:(مَنْ قَالَ: الْحَسَدُ فِي قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ) (رقم

الحديث:٣٠٢٧٢)(١٥٣/٦)، وأبو يعلي الموصلي في مسنده في حديث أبي سعيد الخدري (رضي الله عنه)(رقم الحديث:١٠٨٠)(٤٦٢/١)، والبغوي في شرح السنة في كتاب العلم بَابُ:(التَّحَاسُدِ فِي الْعِلْمِ)(رقم الحديث:١٣٨)(٢٠٤/١)

## سوودو پەندەکان

١. هەر خۆزگە خوازیەك لەگەڵ داواکردن کە لە بەرامبەرەکەت بسەنرێتەوە ئەوە حەسودیە ، بەڵام ئەگەر حەزت نەکرد لەبەرامبەرەکەت بسەنرێتەوە وە دوعاشت بۆ کرد کە خوا فەر وبەرەکەت بخاتە بەرامبەرەکەت ئەوە غیبتەیە .

٢. خۆزگە خواستن لە کاری چاکە دەکرێت،بۆ نمونە وەرگرتنی زانستی شەرعی، وخوێندنەوەو فێرکردنی قورئان .

٣. دروستە خۆزگە بە قورئانخوێنێك بخوازیت کە کار بە قورئانەکەی دەکات ، وە بڵێی خۆزگە منیش وەك ئەو قورئانخوێنەم بزانیبوایە تا بانگخوازی بۆ بکەم و خەڵکی فێرە قورئان بکەم بە ڕەوانی .

٤. دروستە خۆزگە بە دەوڵەمەندێکی خێرخواز ودەسڕۆ بۆ هەژاران ونەداران ونازداران بخوازی،کە ماڵ و سامانەکەی بۆ خزمەتکردنی موسوڵمانانان ببەخشی، کە هیوا بخوازیت کە خوای پەروەردگار موڵك وسامانت پێ ببەخشێت وببێتە توێشووی قیامەتت .

# الحديث الثاني عشر: فەرموودەی دوازدەیەم

عَنْ حُذَيْفَةَ (ﷺ) أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) صَلَّى، فَكَانَ إِذَا مَرَّ بِآيَةِ رَحْمَةٍ سَأَلَ، وَإِذَا مَرَّ بِآيَةِ عَذَابٍ اسْتَجَارَ، وَإِذَا مَرَّ بِآيَةٍ فِيهَا تَنْزِيهٌ لِلَّهِ سَبَّحَ)

حوزەیفـەی کـوڕی یـەمان خـاوەن نهێنیـەکانی پێغەمبـەر(درودو سەلامی خوای لەسەر بێت) دەگێڕتەوە، کە هەر کاتێـك پێغەمبـەری خـوا(درودو سـەلامی خـوای لەسـەر بێـت) لـە نـاو نوێـژدا لـە خوێندنەوەی قورئاندا بگەیشتبوایە بە ئایەتی ڕەحمەتـدا، داوای لـە خوای پەروەردگار دەکرد کە پێی ببەخشێ، وە ئەگەر بگەیشتبوایە بـە ئایـەتی ئـاگر ودۆزەخ داوای لـە خـوای پـەروەردگار دەکـرد کـە بیپارێزێ،وە ئەگەر بە ئایەتی تەنزیهدا بگەیشتبوایە ئەوا تەسـبیحی خوای پەروەردگاری دەکرد .

## تەخریج

أخرجه النسائي في كتاب التطبيق بابُ:(تَعَوُّذُ الْقَارِئِ إِذَا مَرَّ بِآيَةِ عَذَابٍ)،(رقم الحديث: ١٠٠٨)،(ص١٦٥)، وصححه الألباني في صحيح سنن النسائي(١/٣٣٠)،والنسائي في الكبرى في كتاب الصلاة، (في سجود القرآن) باب:( تَعَوُّذُ الْقَارِئِ إِذَا مَرَّ بِآيَةِ عَذَابٍ)،(رقم الحديث :١٠٨٢) ،(٢/٢٣)، وأبو داود في كتاب الصلاة (تفريع أبواب الركوع والسجود)، بَابُ: (مَا يَقُولُ الرَّجُلُ فِي رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ) ،(رقم الحديث:٨٧١) ، (ص١٣٩) ، وصححه الألباني في صحيح سنن أبي داود(١/٢٤٦)،والترمذي في كتاب مواقيت الصلاة بَابُ:(مَا جَاءَ فِي التَّسْبِيحِ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ) (رقم الحديث:٢٦٢)(ص٧٥)،قال أبو عيسى :وهذا حديث حسن صحيح، وصححه الألباني في صحيح سنن الترمذي (١/٢٥٩)،وابن ماجة في كتاب الصلاة ، بَابُ:(مَا جَاءَ فِي القراءة فِي صَلَاةِ اللَّيْلِ) ،(رقم الحديث:١٣٥١)،(ص ٢٣٩)، وصححه الألباني في صحيح سنن ابن ماجة (رقم الحديث:١١١٩)(١/٤٠١)، والدارمي في كتاب الصلاة ،بَابُ:(مَا يُقَالُ فِي الرُّكُوعِ)،(رقم الحديث:١٢٨١)،(١/٣١٨)،وابن حبان في كتاب الصلاة ، باب:(ذِكْرُ الْإِبَاحَةِ لِلْمُتَهَجِّدِ سُؤَالَ الْبَارِي جَلَّ وَعَلا عِنْدَ آيِ الرَّحْمَةِ، وَيَعُوذُ بِهِ عِنْدَ آيِ الْعَذَابِ)،(رقم الحديث:٢٦٠٤) ،(ص٧٥٣) ،وابن خزيمة في كتاب الصلاة ، بَابُ:(الدُّعَاءِ فِي الصَّلَاةِ بِالْمَسْأَلَةِ عِنْدَ قِرَاءَةِ آيَةِ الرَّحْمَةِ، وَالِاسْتِعَاذَةِ عِنْدَ قِرَاءَةِ آيَةِ الْعَذَابِ، وَالتَّسْبِيحِ عِنْدَ قِرَاءَةِ آيَةِ التَّنْزِيهِ ،(رقم الحديث:٥٤٢)(١/٣٠٠)، والبيهقي في السنن الصغير في كتاب الصلاة ، بَابُ :( مَا يَقُولُ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ وَالِاعْتِدَالِ وَالْقُعُودِ وَمَا يَقُولُ إِذَا مَرَّ بِآيَةِ رَحْمَةٍ أَوْ بِآيَةِ عَذَابٍ) (رقم الحديث:٤٠٥)(١/١٣٤)، وابن أبي شيبة في المصنف في كتاب الزهد ، باب(من كلام عمر بن عبدالعزيز)(رقم الحديث:٣٥٠٨٥)،(٧/١٨٣)،وعبدالرزاق الصنعاني في مصنفه في كتاب الصلاة باب:(الرجل يدعو ويسمي في دعائه):(رقم الحديث: ٤٠٦٨) ،(٢/٣٠٠)، والبيهقي في السنن الكبير في كتاب الصلاة ، بَابُ:(الْوُقُوفِ عِنْدَ آيَةِ الرَّحْمَةِ وَآيَةِ الْعَذَابِ وَآيَةِ التَّسْبِيحِ :(رقم الحديث:٣٧٣٦) (٤/٤٤٩)

## حوزەیفەی كوڕی یەمان( خوا لێی ڕازی بێت )

حوزەیفـەی کـوڕی یـەمان خـاوەن نهێنیـەکانی پێغەمبـەر(درودو سـەلامی خـوای لەسـەر بێت)،دووسـەدو بیسـت فـەرمودەی لـە پێغەمبەری خـوا(درودو سـەلامی خـوای لەسـەر بێـت) گێڕاوەتـەوە، هەردوو پێشەوا بوخاری وموسلیم دوازدە فـەرموودەیان بـە یەکـەوە لیٚ گێڕاوەتەوە ،وە هەشت فـەرمودەش پێشـەوا بوخـاری بـە تـەنیا گێڕاویەتیـەوە کـە پێشـەوا موسـلیم نەیگێڕاوەتـەوە، وە پێشـەوا موسلیمیش حەڤدە فەرمودەی بـە تـەنیا گێڕاوەتـەوە کـە پێشـەوا بوخاری نەیگێڕاوەتەوە، لە شاری مـەدائین لـە سـاڵی ٣٦ ی کۆچـی دوای شەهیدبوونی پێشەوا عوسمانی کوڕی عەففان (خـوا لێـی ڕازی بێت) وەفاتی کردووە .

## سوودو پەندەکان

١. سوننەتە ئەگەر گەیشتیتە ئایەتێك کە باسی بـەزەیی دەکـات ، داوا لە خوا بکەیت کە بەزەیی پێتدابێتەوە .

٢. سوننەتە ئەگەر گەیشتیتە ئایەتێك کە باسی ئـاگر ودۆزەخ و عـەزاب دەکات، داوا لە خوا بکەیت کە بتپارێزی لە ئاگر ودۆزەخ و عەزاب .

٣. سوننەتە ئەگەر گەیشتیتە ئایەتێك کە باسی تەنزیه وپاك وبێگەردی خوای گەورە دەکات بڵێی سبحان الله .

# الحديث الثالث عشر: فەرموودەی سێزدەیەم

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، أَنَّ النَّبِيَّ(ﷺ) قَالَ لَهُ ‹ اقْرَأِ الْقُرْآنَ فِي شَهْ › ، قَالَ: إِنِّي أَجِدُ قُوَّةً، قَالَ ‹ اقْرَأْ فِي عِشْرِ ٠، › ،قَالَ:إِنِّي أَجِدُ قُوَّةً، قَالَ ‹ اقْرَأْ فِي خَمْسَ عَشْ ٠ر › ،قَالَ: إِنِّي أَجِدُ قُوَّةً، قَالَ ‹ اقْرَأْ فِي عَشْ › ،قَالَ: نِّي أَجِدُ قُوَّةً، قَالَ ‹ اقْرَأْ فِي سَبْعٍ، وَلا تَزِيدَنَّ عَلَى ذَلِ ›.

عەبدوڵڵای كوڕی عەمر (خوا لێ یان ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا (درود و سەلامی خوای لەسەر بێت) پێی فەرموو: قورئان خەتم بكە لە مانگێكدا، عەبدوڵڵای كوڕی عەمر (خوا لێ یان ڕازی بێت)ووتی: من توانای زۆر لەوە زیاترم هەیە ،پێغەمبەری خوا (درودوسەلامی خوای لەسەر بێت) پێی فەرموو:قورئان خەتم بكە لە بیست رۆژدا،عەبدوڵڵای كوڕی عەمر (خوا لێ یان ڕازی بێت)ووتی:من توانای زۆر لەوە زیاترم هەیە،پێغەمبەری خوا(درودوسەلامی خوای لەسەر بێت) پێی فەرموو: قورئان خەتم بكە لە پازدە رۆژدا ، عەبدوڵڵای كوڕی عەمر (خوا لێ یان ڕازی بێت) ووتی:من توانای زۆر لەوە زیاترم هەیە،پێغەمبەری خوا(درودوسەلامی خوای لەسەر بێت) پێی فەرموو:قورئان خەتم بكە لە دە رۆژدا، عەبدوڵڵای كوڕی عەمر(خوا لێ یان ڕازی

بێـــت)ووتی:من توانـــای زۆر لـــەوە زیـــاترم هەیە،پێغەمبـــەری خوا(درودوسەلامی خوای لەسەر بێت) پێـی فـەرموو: قورئـان خـەتم بکە لە هەفتەیەك دا ، وە لە هەفتەیەك کەمتر خەتم نەکەیت ))

## تەخریج

أخرجـه البخـاري في كتـاب فضـائل القـرآن ، بَابٌ:(فِي كَمْ يُقْـرَأُ الْقُـرْآنُ)، (رقم الحديث:٥٠٥٢) ، (ص١٣٠٤) ، ومسلم في كتاب الصيام ، بَابُ:(النَّهْـيِ عَـنْ صَـوْمِ الدَّهْرِ لِمَنْ تَضَرَّرَ بِهِ أَوْ فَوَّتَ بِهِ حَقًّا أَوْ لَمْ يُفْطِرِ الْعِيدَيْنِ وَالتَّشْرِيقَ، وَبَيَانِ تَفْضِيلِ صَـوْمِ يَـوْمٍ، وَإِفْطَـارِ يَـوْمٍ) (رقم الحـديث:١٨٤ - (١١٥٩) (ص٥١٤) ،وأبـو داود في كتـاب الصلاة في (أبواب قراءة القرآن وتحزيبه وترتيله)، بَابٌ:(فِي كَمْ يُقْرَأُ الْقُرْآنُ)،(رقم الحديث: ١٣٨٨)، (ص٢١٦)، وصححه الألباني في صحيح سنن أبي داود(٣٨٤/١)،والنسائي في كتاب الصيام باب:( صَوْمُ عَشَرَةِ أَيَّامٍ مِنَ الشَّهْرِ وَاخْتِلَافُ أَلْفَاظِ النَّاقِلِينَ لِخَبَرِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو فِيهِ)(رقم الحديث:٢٣٩٦)(ص٣٧٢)، وصححه الألباني في صحيح سنن النسائي (١٦٥/٢)،وفي السنن الكبرى في كتاب الصيام باب:( صَوْمُ الرَّجُلِ مَعَ زَوْجَتِهِ وَحَقُّهَا فِي ذَلِكَ) (رقم الحديث:٢٩٣٤)(٢٥٨/٣)،وأحمد في المسند في مسند عبدالله بن عمرو(رضي الله عنهما) (رقم الحديث:٦٨٦٢) (٤٤٨/١١)،وابن حبان في صحيحه في كتاب الصوم ، باب:(ذِكْرُ الزَّجْرِ عَنْ حَمْلِ الْمَرْءِ عَلَى نَفْسِهِ مِنَ الصِّيَامِ مَا عَسَى يَضْعُفُ عَنْهُ) (رقم الحديث:٣٥٧١) (ص٩٨٦)،والبيهقي في شعب الإيمان في باب:(في تَعْظِيمِ القُـرْآن)، فَصْـلٌ :(فِي مِقْـدَارِ مَـا تُسْـتَحَبُّ فِيـهِ الْقِـرَاءَةُ ) (رقم الحـديث: (١٩٧٥)(٢٩٧/٤)،والبيهقي في سنن الكبرى بَابُ:( مِقْدَارِ مَا يُسْتَحَبُّ لَهُ أَنْ يَخْتِمَ فِيهِ الْقُرْآنَ مِنَ الْأَيَّامِ)،(رقم الحديث:٤١١٤)، (٣٠/٥)، والبيهقي في السنن الصغير ،في

کتاب فضائل القرآن، بَابٌ:( فِي تَرْتِيلِ الْقُرْآنِ وَتَحْسِينِ الصَّوْتِ بِهِ)،(رقم الحديث:١٠٠٨) ، (٢٨٠/١)، والبغوي في شرح السنة في كتاب فضائل القرآن، بَابٌ:( فِي كَمْ يُقْرَأُ) (رقم الحديث:١٢٢٣)(٢٧٢/٣)

## کورتەی ژیانی عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ( خوا لێ یان ڕازی بێت )

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاسی کوڕی وائلی قوڕەیشی سەهمی،حەفتسەد فەرمودەی لە پێغەمبەر(درودوسەلامی خوای لەسەر بێت) گێڕاوەتەوە، خۆی وباوکی هاوەڵن وە باپیریان بە بێ باوەڕی مرد وموسولمان نەبوو، ڕۆژێکیان باپیری لەگەڵ ئەبو جەهل عەمری کوڕی هیشام لە ڕێگا پیاسەیان دەکرد،بە پێغەمبەری خوا(دروودو سەلامی خوای لەسەر بێت) گەیشت و هەردوکیان دەستیان کرد بە گاڵتە کردن بە پێغەمبەری خوا(دروودو سەلامی خوای لەسەر بێت).بەڵام پێغەمبەری خوا(دروودو سەلامی خوای لەسەر بێت) وەڵامی نەدانەوە،بەڵام پاش ئەوەی لێ یان جیابۆوە دەستی بەرز کردەوە وفەرمووی((خودایە دڕکێك لە دڕکەکانی زەوی بۆ ڕەوانە بکە))،ئەم دوعایەی لە عاسی کوڕی وائیل کرد، کاتێکی کەمی پێچوو، عاسی کوڕی وائیل دڕکێکی لە پێ ڕاچوو، پێیەکانی هەڵئاوسا، وکەوتە سەر جێگا ونەیتوانی

هەڵبستێتەوە،تا وای لێهات پێ یەكانی ووشك بوو وە بەرەو مەرگ دەچوو، نەخۆشی بۆ هەموو لاشەی هات، وە عەمری كوڕی پزیشكی بۆ هێنا، بەڵام پێش گەیشتنی بە هیلاك چوو و مرد .

حەفسەد فەرموودەی لە پێغەمبەر(درودو سەلامی خوای لەسەر بێت) گێڕاوەتەوە ، حەفت فەرمودە هەردوو پێشەوا بوخاری وموسلیم بەیەكەوە گێڕاویاەتەوە ، وە پێشەوا بوخاری هەشت فەرمودەی بە تەنیا گێڕاوەتەوە ،كە پێشەوا موسلیم نەیگێڕاوەتەوە و پێشەوا موسلمیش بیست فەرمودەی بە تەنیا گێڕاوەتەوە كە پێشەوا بوخاری نەیگێڕاوەتەوە .

خۆی وباوكی پێش فەتحی مەككە كۆچیان كرد، وە پێش باوكی موسوڵمان بوو، وە لە نێوان لەدایك بوونی خۆی و باوكی تەنها دوازدەساڵ بوو، لە ساڵی شەست وسێ ی كۆچی (-٦٣كۆچی) وەفاتی كرد .

## سوود و پەندەكان

١. دروستە قورئان خەتم بکەیت لە مانگێك .

٢. دروستە قورئان خەتم بکەیت لە بیست ڕۆژدا .

٣. دروستە قورئان خەتم بکەیت لە پازدە ڕۆژدا .

٤. دروستە قورئان خەتم بکەیت لە دەرۆژدا .

٥. دروستە قورئان خەتم بکەیت لە هەفتەیەك .

٦. دروستە قورئان خەتم بکەیت لە پێنج رۆژدا .

٧. دروستە قورئان خەتم بکەیت لە سێ رۆژدا .

٨. دروست نیە قورئان لە سێ رۆژ کەمتر خەتم بکەیت.

٩. هەندێك لە زانایان بۆ موراجەعەکردنەوە ڕێگایان داوە بە سێ رۆژ قورئان خەتم بکەیت.

# الحديث الرابع عشر: فەرموودەی چواردەیەم

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ):" إِذَا قَرَأَ ابْنُ آدَمَ السَّجْدَةَ فَسَجَدَ اعْتَزَلَ الشَّيْطَانُ يَبْكِي، وَقَالَ:يَا وَيْلَهُ أُمِرَ ابْنُ آدَمَ بِالسُّجُودِ فَسَجَدَ فَلَهُ الْجَنَّةُ، وَأُمِرْتُ بِالسُّجُودِ فَعَصَيْتُ فَلِيَ النَّارُ "

ئـەبو هورەیرە(خـوا لێـی ڕازی بێت)دەگێڕتەوە:کـە پێغەمبـەری خوا(دروودو سـەلامی خـوای لەسـەر بێـت) فەرموویەتی:ئەگـەر هـەر بەندەیەکی موسولمانی خودا سورەتی سـوژدە بخـوێنێ ، یەکسـەر کڕنۆشـی تـیلاوە دەبـات، شـەیتان دەچـێتە سوچـێکەوە دەگریـێ، ودەڵێ:وەیـل بـۆ ئـەو بەندەیـە فـەرمانی کڕنۆشـی پـێ کرا،ئـەویش یەکسەر کڕنۆشی بـرد،وە بەهەشـتی پـێ مسـۆگەر کـرد ،وە منـیش فەرمانم پێ کرا کە کڕنۆش ببەم، بەڵام سەرپێچیم کـرد ، وکڕنۆشـم نەبرد، وە بەشی من ئاگری دۆزەخە ))

## تەخریج

أخرجه مسلم في كتاب الإيمان ، بَابُ بَيَانِ إِطْلَاقِ اسْمِ الْكُفْرِ عَلَى مَنْ تَرَكَ الصَّلاةَ) ، (رقم الحديث:١٣٣-(٨١)، (ص٥١)، وابن ماجة في كتاب إقامة الصلوات والسنة فيها، بَابُ:( سُجُودِ الْقُرْآنِ) ، رقم الحديث:(١٠٥٢)،(ص١٨٩)، وصححه الألباني في صحيح سنن ابن ماجة (رقم الحديث:٨٧١)(٣١١/١)،وابن حبان في كتاب فضائل القرآن باب:( ذِكْرُ رَجَاءِ دُخُولِ الْجِنَانِ لِمَنْ سَجَدَ لِلَّهِ فِي تِلَاوَتِهِ) (رقم الحديث:٢٧٥٩)(ص٧٨٨)،وابن خزيمة في كتاب الصلاة بَابُ فَضْلِ السُّجُودِ عِنْدَ قِرَاءَةِ السَّجْدَةِ، وَبُكَاءِ الشَّيْطَانِ وَدُعَائِهِ بِالْوَيْلِ لِنَفْسِهِ عِنْدَ سُجُودِ الْقَارِئِ السَّجْدَةَ )(رقم الحديث :٥٤٩)(٣٠٤/١) ، والبيهقي في شعب الإيمان فَصْلٌ فِي بَرَاءَةِ نَبِيِّنَا (ﷺ) فِي النُّبُوَّةِ ، باب : (حُبُّ نَبِيِّنا (ﷺ) في النبُوَّةِ ) (رقم الحديث: ١٤٠٧)(٣٦٥/٣) ، والبيهقي في السنن الكبرى في كتاب الصلاة،بَابُ:(فَضْلِ سُجُودِ التِّلَاوَةِ) ، رقم الحديث:(٣٧٥٢) ، (٤٥٧/٤)








## سوودو پەندەکان

١. سوننەتە کە گەیشتیتە ئایەتی پـازدە لـە سـورِەتی سـوژدە ، سوژدە ببەیت .

٢. شوێنەکانی سوژدە بردن لە قورئان

- کۆتایی ئایەت لە سورەتی ئەعراف .
- ئایەتی پازدە لە سورەتی ڕەعد .
- ئایەتی پەنجا لە سورِەتی نەحل .
- ئایەتی ١٠٩ لە سورِەتی ئیسرا .
- ئایەتی ٥٨ لە سورِەتی مەریەم .
- ئایەتی ١٨ لە سورِەتی الحج
- ئایەتی ٢٧ لە سورِەتی النمل .
- ئایەتی ١٥ لە سورەتی سوجدە .
- ئایەتی ٦٠ لە سورەتی الفرقان .
- ئایەتی ٣٨ لە سورەتی فصلت

٣. زانایان ناکۆکن لەسـەر هەنـدێ شـوێن لـە قورئـان بـۆ سـوژدە بردن .

- لای شـافعیەکان و حەنبەلیـەکان سـورەتی الحـج دوو سوژدەی تێدایە ، یەکێکیان لە سەرەتای سـورِەتەکەیە

و دووەمیــان لــە كۆتــایی ســورەتەكەیە ، بــەڵام لای حەنەفیــەكان و مالیكیــەكان تــەنیا یــەك ســوژدە لــە سوڕەتی حەج هەیە ئەویش لە سەرەتاكەیەتی .

- لای حەنەفیــەكان و مالكیــەكان ئایــەتی ســێزدەی سورەتی (ص) سوژدەی تیلاوەیە بەڵام لای شافعیەكان و حەنبەلیەكان سوژدەی سوپاسگوزاریە .
- سێ شوێنمان هەیە كە زانایان ناكۆكن ئایا سوژدەی تیلاوەیــە یــان نــا . پێشــەوا مالیــك وای دەبینــێ كــە ســوژدەی تــیلاوە نیــە ، بــەڵام ســێ پێشــەواكەی تــر : پێشــەوا شــافیعی و ئەحمــەدی كــوڕی حەنبــەل و ئــەبو حەنیفە لەگەڵ ئەوەن كە سوژدەی تیلاوەیە
- سوره النجم
- سوره الانشقاق
- سورەتی العلق

## الحديث الخامس عشر: فەرموودەی پازدەیەم

عَنِ الْبَيَاضِيِّ (رضي الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) خَرَجَ عَلَى النَّاسِ وَهُمْ يُصَلُّونَ. وَقَدْ عَلَتْ أَصْوَاتُهُمْ بِالْقِرَاءَةِ، فَقَالَ «إِنَّ الْمُصَلِّيَ يُنَاجِي رَبَّهُ، فَلْيَنْظُرْ بِمَا يُنَاجِيهِ بِهِ، وَلا يَجْهَرْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَعْضٍ بِالْقُرْآنِ».

بەییازی (ڕەزای خوای لەسەر بێت)دەگێڕتەوە: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا(دروودو سەلامی خوای لەسەر بێت)دەرچوو بۆ ناو خەڵکی،کە خەڵکیش لە حاڵەتی نوێژ کردنی سوننەتی شەونوێژ بوون، نوێژخوێنان لە قورئان خوێندنەکەیاندا دەنگیان بەرز کردبۆوە ،پێغەمبەریش(دروودو سەلامی خوای لەسەر بێت)پێیانی فەرموو: بێ گومان نوێژخوێن گفتوگۆ وموناجات لەگەڵ خوای پەروەردگار دەکات ، با بزانێت چۆن چۆنی موناجاتی خوای گەورە دەکات ، با کەسیش لە قورئان خوێندنەکەیدا دەنگی بەرز نەکاتەوە بە قیرائەتەکەی بەسەر کەسێکی تر .)).

## تەخریج

أخرجه أبو داود في كتاب الصلاة ، بَابٌ:(فِي رَفْعِ الصَّوْتِ بِالْقِرَاءَةِ فِي صَلَاةِ اللَّيْلِ) ، (رقم الحديث:١٣٣٢)،(ص٢٠٧)، وصححه الألباني في صحيح سنن أبي داود (٣٦٥/١)، ومالك في الموطأ في كتاب الصلاة باب:(العَمَلُ فِي القِراءَةِ) ، (رقم الحديث:٢١٣)،(١٣١/١)،وأحمد في المسند في مسند ابن عمر (رضي الله عنهما) (رقم الحديث: ٥٣٤٩)(٢٥١/٩)،والنسائي في السنن الكبرى في كتاب الإعتكاف ، باب:( هَلْ يَعِظُ الْمُعْتَكِفُ، وَذِكْرُ اخْتِلَافِ النَّاقِلِينَ لِلْخَبَرِ فِي ذَلِكَ)( (رقم الحديث:٣٣٥٠)(٣٨٧/٣)، والبيهقي في شعب الإيمان في باب:(في تَعْظِيمِ القُرْآن)، فَصْلٌ:( فِي تَرْكِ التَّعَمُّقِ فِي الْقُرْآنِ)، (رقم الحديث:٢٤١٠)(٩٥/٥)،والبيهقي في السنن الكبرى بَابُ:(مَنْ لَمْ يَرْفَعْ صَوْتَهُ بِالْقِرَاءَةِ شَدِيدًا إِذَا كَانَ يَتَأَذَّى بِهِ مَنْ حَوْلَهُ)،رقم الحديث:٤٧٦٥)،(٣٧٦/٥)، وابن خزيمة في كتاب الصلاة ، بَابُ:(الزَّجْرِ عَنِ الْجَهْرِ بِالْقِرَاءَةِ فِي الصَّلَاةِ إِذَا تَأَذَّى بِالْجَهْرِ بَعْضُ الْمُصَلِّينَ غَيْرَ الْجَاهِرِ بِهَا)،(رقم الحديث:١١٦٢)،(٥٧٥/١)، وابن أبي شيبة في المصنف في كتاب الدعاء ، باب:( فِي رَفْعِ الصَّوْتِ بِالدُّعَاءِ) (رقم الحديث: ٢٩٦٥٧)(٨٦/٦)، وعبدالرزاق الصنعاني في كتاب الصلاة ، بَابُ:(قِرَاءَةِ اللَّيْلِ) (رقم الحديث: ٤٢١٧) (٣٢٥/٢)،والبغوي في شرح السنة في كتاب الصلاة بَابُ الْقِرَاءَةِ خَلْفِ الإِمَامُ وَمَنْ قَالَ: لَا يَقْرَأُ إِذَا جَهَرَ الإِمَامُ) (رقم الحديث:٦٠٨) (٢٥٨/٢)









# كورتەی ژیانی بەییازی

عەبـدوڵڵای کـوڕی غـەننامی کـوڕی ئەوسـی بـەییازی ئەنسـاڕیە ، هـاوەڵی پێغەمبـەری خوایـە(دروودو سـەلامی خـوای لەسـەر بێـت)، جێنشینی مەدینە بوو .

## سوودو پەندەکان

١. فەزڵی سوننەتی شەونوێژکردن .
٢. دروستە شەونوێژ لە مزگەوت بکرێت .
٣. دروست نیە لە کاتی ئەدا کردنی شەونوێژ قورئان بە دەنگی بـەرز بخـوێنی ، ئەگـەر لـە نـاو مزگـەوت موسـوڵمانان ئیعتیکافیـان کردبـوو چـونکە نوێـژخوێنان و کەسـانی نـاو مزگەوت ئەزیەت دەدەیت.
٤. ئەگەر بەرزکردنەوەی دەنگ بۆ نوێژخوێنان دروسـت نـەبێت کاتێك خەلکانێکی دەوروبەریان ئەزیەت بـدەن ، باسـکردنی دونیا لە مزگەوت زۆر ئەولاترە کە دروست نەبێت .
٥. دەبێـت موسـوڵمان بـە ئەدەبـەوە موناجـاتی خـوای پەروەردگار بکات.

## الحديث السادس عشر: فەرموودەی شازدەیەم

عن قَتادَة (رضي الله عنه) قَالَ: قُلْتُ يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، أَنْبِئِينِي عَنْ خُلُقِ رَسُولِ اللَّه (ﷺ)، قَالَتْ: أَلَيْسَ تَقْرَأُ الْقُرْآنَ؟ قَالَ: قُلْتُ: بَلَى، قَالَتْ «فَإِنَّ خُلُقَ نَبِيِّ اللَّهِ (ﷺ) الْقُرآن».

قەتادەی کوڕی نوعمان (خوا لێی ڕازی بێت)فەرمووی:لە دایکی بڕواداران دایە عائیشەم (خوا لێی ڕازی بێت) پرسی:پێم ڕابگەینە ئایا ڕەوشتی پێغەمبەر(درودو سەلامی خوای لەسەر بێت)چۆن بوو،دایکی بڕواداران دایە عائیشە(خوا لێی ڕازی بێت)وەلامی دایەوە: ئەی تۆ قورئان ناخوێنیتەوە؟ ،قەتادەی کوڕی نوعمان(خوا لێی ڕازی بێت)فەرموی:با قورئان دەخوێنمەوە، دایکی بڕواداران دایە عائیشە(خوا لێی ڕازی بێت) فەرمووی : دەی ڕەوشتی پێغەمبەر (درودو سەلامی خوای لەسەر بێت) قورئان بوو ((

## تەخریج

أخرجه مسلم في كتاب صلاة المسافرين وقصرها بَابُ جَامِعِ صَلَاةِ اللَّيْلِ، وَمَنْ نَامَ عَنْهُ أَوْ مَرِضَ) (رقم الحديث:١٣٩ - (٧٤٦) (ص٣٣٦)،النسائي في كِتَابُ:قِيَامِ اللَّيْلِ وَتَطَوُّعِ النَّهَارِ، بَابُ (قِيَامِ اللَّيْلِ)،(رقم الحديث:١٦٠١) ،(ص ٢٦٤) ، صححه الألباني في صحيح سنن النسائي (٥٢٠/١)،والنسائي في السنن الكبرى في كتاب الصلاة ، باب: ذِكْرُ اخْتِلَافُ النَّاقِلِينَ لِخَبَرِ عَائِشَةَ فِي ذَلِكَ)،(رقم الحديث:٤٢٤) ، (٢٤٤/١)،و ابن خزيمة في كتاب الصلاة في(جماع أبواب صلاة التطوع بالليل) بَابُ :(ذِكْرِ خَبَرٍ نَسَخَ فَرْضَ قِيَامِ اللَّيْلِ بَعْدَمَا كَانَ فَرْضًا وَاجِبًا) ، (رقم الحديث:١١٢٧) ، (٥٥٩/١)، وابن حبان في كتاب الصلاة ،باب:(فَصْلٌ فِي قِيَامِ اللَّيْلِ) ، (رقم الحديث:٢٥٥١)،( ص٧٤٠) ، والبيهقي في شعب الإيمان فَصْلٌ :(فِي خُلُقِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) وَخَلْقِهِ )، باب:(في حُبِّ النَّبِيِّ (ﷺ)،(رقم الحديث:١٣٥٩)،(٣٠٥/٣) ،وعبدالرزاق الصنعاني في كتاب الصلاة بَابُ:(صَلَاةُ النَّبِيِّ (ﷺ) مِنَ اللَّيْلِ وَوِتْرِهِ)(رقم الحديث:٤٧٢٦) (٤١٠/٢).

## کورتەی ژیانی قەتادەی کوڕی نوعمان

قەتادەی كوڕی نوعمانی كوڕی زەیدی كوڕی عامری ئەنساڕیە ، برای ئەبو سەعیدی خودریە لە دایكی ، ئەم هاوەڵە بوو لە جەنگی ئوحود چاوێكی بەربۆوە سەر ڕوومەتی ، هێنایانە لای پێغەمبەری خوا (درودو سەلامی خوای لەسەر بیت)، پێغەمبەریش (درودو سەلامی خوای لەسەر بیت) بە دەستی موبارەكی خستیەوە شوێنی خۆی ، ئەم چاوەی زۆر تەندروستتر بوو لە چاوەكەی پێشوو ، حەفت فەرموودەی ڕیوایەت كردووە ، لە ساڵی بیست وسێ ی كۆچی وەفاتی كردووە ، وە ٦٥ ساڵ ژیا (خوا لێی ڕازی بێت).

## سوودو پەندەكان

١. ڕەوشتی پێغەمبەر (درودو سەلامی خوای لەسەر بێت) قورئان بووە .
٢. قورئان لە هەر شوێنێك فەرمانی بە ئەنجامدانی كارێك كردبێت ، پێغەمبەریش (درودو سەلامی خوای لەسەر بێت) یەكسەر ئەنجامی داوە .
٣. قورئان لە هەر شوێنێك قەدغەی كردبێت لە ئەنجامدانی كارێك كە نەیكات، پێغەمبەریش (درودو سەلامی خوای لەسەر بێت) یەكسەر خۆی لێ دوور خستۆتەوەو ئەنجامی نەداوە .

# الحديث السابع عشر: فەرموودەی حەڤدەیەم

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ(ﷺ)، قَالَ: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ وَهُوَ عَلَى نَاقَةٍ يَقْرَأُ بِسُورَةِ الْفَتْحِ، وَهُوَ يُرَجِّعُ»

**عەبــدوڵڵای كــوڕی موغەففــەلی مــوزەنی فەرمووی:((لــە ڕۆژی ئــازادكردنی مەككــەدا پێغەمبــەری خــودام(دروودو ســەلامی خــوای لەسەر بێت)بینی بـەڕێوە بـە سـواری ووشـترەكەی خـۆی سـوڕەتی فـەتحی دەخوێنـد ، لـە كـاتی خوێندنەكـەی بـە دەم ڕۆیشـتنەكەدا دەنگی خۆی بەسۆزو ئاوازەوە دەلەراندەوە .**

## تەخریج

أخرجه البخاري في كتاب المغازي بَابٌ:(أَيْنَ رَكَزَ النَّبِيُّ (ﷺ) الرَّايَةَ يَوْمَ الفَتْحِ؟)،(رقم الحديث :٤٢٨١) ،(ص١٠٦٥) ، ومسلم في كتاب صلاة المسافرين وقصرها، بَابُ:(ذِكْرِ قِرَاءَةِ النَّبِيِّ (ﷺ)سُورَةَ الْفَتْحِ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ) ، (رقم الحديث: ٢٣٨ - ٧٩٤) ،(ص٣٥٧) ،وأبو داود في كتاب الصلاة باب:(كيف يستحبُّ الترتيل في القراءة)،رقم الحديث:١٤٦٧)،(ص٢٢٧)،والنسائي في السنن الكبرى في كتاب فضائل القرآن باب:(القراءة على الدابة)(رقم الحديث: ٨٠٠٨)(٢٧٥/٧)، وأحمد في مسنده في حديث عبدالله بن مغفل المزني ، رقم الحديث: ١٦٧٨٩)(٣٤٥/٢٧) ، والبيهقي في السنن الصغير في كتاب فضائل القرآن بَابٌ:(فِي تَرْتِيلِ الْقُرْآنِ وَتَحْسِينِ الصَّوْتِ بِهِ) رقم الحديث:٩٩٥)(٢٧٧/١)، وفي السنن الكبرى في كتاب الصلاة ،بَابُ:(كَيْفَ قِرَاءَةُ الْمُصَلِّي) ، (رقم الحديث:٢٤٦٠)(٤٣١/٣)، والبغوي في شرح السنة في كتاب فضائل القرآن، بَابُ كَيْفَ الْقِرَاءَةُ وَالتَّرْجِيعُ فِيهَا)(رقم الحديث:١٢١٥) (٢٦٤/٣)

# عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل

عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەلی کوڕی عەبد غـونمی موزەنیـە، یـەکێك لەو دە کەسە بوو کـە پێشـەوا عومـەر(خوا لێـی ڕازی بێت)ڕەوانـەی بەسرەی کرد،بۆ ئەوەی خەڵکەکەی فێـرە ئـایی بکـات ، جێنشـینی یەکەی لـە بەسـرە بـوو ، وە ٤٣ فـەرمودەی لـە پێغەمبـەر (درووودو سەلامی خوای لەسـەر بێـت) گێڕاوەتـەوە ، لـە سـاڵی ٥٩ ی کۆچـی دوایی کردووە .

## سوودو پەندەکان

١. دروستە لەسەر سواریدا قورئان بخوێنی .
٢. لـە ڕۆژی ئـازادکردنی مەککـەدا پێغەمبـەری خـودا(درووودو سەلامی خوای لەسەر بێت) لەسەر ووشترەکەی خۆی بـوو، سـورەتی فـەتحی دەخوێنـد، وکۆتـایی ئایەتەکـەی دەلەراندەوە ، وەك بانگەوازی بۆ ئەو موشـریکانەی مەککـە کە هێشتا موسوڵمان نەببون .
٣. فەزڵی قورئان خوێندن .
٤. فەزڵی سورەتی فەتح .
٥. گەورەیی ومەزنی فەتحکردنی مەککە .

## الحديث الثامن عشر: فەرموودەی هەژدەیەم

عَـنْ ابْـنِ عُمَـرَ(رضي اللـه عـنهما): أَنَّ رَسُـولَ اللَّـه (ﷺ ) نَهَـى أَنْ يُسَافَرَ بِالْقُرْآنِ إِلَى أَرْضِ الْعَدُوِّ، مَخَافَةَ أَنْ يَنَالَهُ الْعَدُوُّ))

**عەبـدوڵڵای كـوڕی عومـەر(خوا لـێ یـان ڕازی بێت)فەرموویـەتی ((پێغەمبەری خوا (دروودو سەلامی خوای لەسەر بێت)قەدەغـەمانی كرد بوو كە گەشت بە قورئان بكەین بۆ زۆنی دوژمن ))**

## تەخریج

أخرجه البخاري في كتاب الجهاد والسير، بَابُ:(السَّفَرِ بِالْمَصَاحِفِ إِلَى أَرْضِ العَدُوِّ) (رقم الحديث:٢٩٩٠) ، (ص٧٦٨)،ومسلم في كتاب الإمارة ، بَابُ:(النَّهْيِ أَنْ يُسَافَرَ بِالْمُصْحَفِ إِلَى أَرْضِ الْكُفَّارِ إِذَا خِيفَ وُقُوعُهُ بِأَيْدِيهِمْ) ،(رقم الحديث:٩٢ - (١٨٦٩) (ص٩٠٤)،وأبـو داود في كتـاب الجهـاد ، بَابٌ:(فِي الْمُصْحَفِ يُسَافَرُ بِـهِ إِلَى أَرْضِ الْعَدُوِّ)،(رقم الحديث:٢٦١٠)،(ص٣٩٥) ، صححه الألباني في صحيح سنن أبي داود (١٢٥/٢)، وابـن ماجة في كتاب الجهاد ، بَابُ:(النَّهْيِ أَنْ يُسَافَرَ بِالْقُرْآنِ إِلَى أَرْضِ الْعَدُوِّ)، رقم الحديث:٢٨٧٩)،(ص٤٨٨) ، صححه الألباني في صحيح سنن ابن ماجة (٢٣٤٥)(٤١٦/٢) ،وابن حبان في كتاب السير، باب:( الخُرُوجِ وَكَيْفِيَّةِ الجِهادِ) ،(رقم الحـديث: ٤٧١٥ ، (ص١٢٧١)،والبيهقـي في شـعب الإيمـان في باب:(في تَعْظِيمِ القُرْآن)،(فَصْلٌ فِي صِيَانَةِ الْمُسَافِرِ بِمَصَاحِفِ الْقُرْآنِ إِلَى أَرْضِ الْعَدُوِّ)،(رقم الحديث:٢٠٩١) ، (٣٨٣/٤)،والبيهقي في السـنن الصغير ، كتـاب فضـائل القـرآن بَابُ:(لا يَحْمِلُ الْمُصْحَفَ إِلَّا طَاهِرٌ وَلَا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ جُنُبٌ)، (رقم الحـديث:١٠١١) ، (٢٨١/١) ،وابن أبي شيبة في كتاب الرد على أبي حنيفة باب:( مَسْأَلَةُ السَّفَرِ بِالْقُرْآنِ إِلَى أَرْضِ الْعَدُوِّ) :(رقم الحـديث: ٣٦٠٥٣)(٢٧٧/٧) ،وعبـدالرزاق الصـنعاني في

المصنف في كتاب الجهاد باب:(حَمْلُ السِّلاحِ والقُرْآنِ إلى أَرْضِ العَدُوِّ)(٩٤٧٣)(١٤٥/٥)،والبغوي في شرح السنة في كتاب فضائل القرآن، بَابُ:( لا يُسَافَرُ بِالْقُرْآنِ إِلَى أَرْضِ الْعَدُوِّ )، (رقم الحديث :١٢٣٣)(٢٨٩/٣)

وفي رواية لمسلم

عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: " لا تُسَافِرُوا بِالْقُرْآنِ إِلَى أَرْضِ الْعَدُوِّ فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ يَنَالَهُ الْعَدُوُّ "

**لە دەستەواژەی موسلیم ((نەکەن گەشت بکەن بە قورئانەوە بۆ زۆنی دوژمن چونکە من دڵنیا نیم لەوەی بگاتە دەست دوژمن)**

## تەخریج

رَوَاهُ مُسْلِمٌ في كتاب الإمارة ، بَابُ :(النَّهْيِ أَنْ يُسَافَرَ بِالْمُصْحَفِ إِلَى أَرْضِ الْكُفَّارِ إِذَا خِيفَ وُقُوعُهُ بِأَيْدِيهِمْ )، (رقم الحديث :٩٤ - (١٨٦٩) (ص٩٠٥)،وأحمد في مسنده في مسند ابن عمر(رضي الله عنهما)(رقم الحديث٤٥٠٧)،(٩٩/٨)،البيهقي في شعب الإيمان في باب:(فِي تَعْظِيمِ الْقُرْآن)، فَصْلٌ فِي تَعْظِيمِ الْمُصْحَفِ بِأَنْ لا يُحْمَلَ فَوْقَهُ مَتَاعٌ وَلا يُنْبَذُ حَيْثُ اتَّفَقَ) (رقم الحديث: ٢٤١٤) (٩٩/٥)

## کورتەی ژیانی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ( ڕەزای خوایان لەسەر بێت )

**عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتتابی کوڕی نوفەیلی قوڕەیشیە، مەدەنیە، هاوەڵێکی زانای فەرمودەناسی فەقیهە،دووهەزارو شەشسەدو سی فەرموودەی لە پێغەمبەر(درووود وسەلامی خوای لە سەر بێت) گێڕاوەتەوە ، پێشەوا بوخاری لە هەشتاو یەك فەرموودە بە تەنیا گێڕاویەتیەوە کە پێشەوا موسلیم**

نەیگێڕاوەتەوە ،وە پێشەوا موسلمیش سی ویەك فەرموودەی بە تەنیا گێڕاویەتیەوە کە پێشەوا بوخاری نەیگێڕاوەتەوە ،یەکێکە لە کەڵەپیاوەکانی ناو هاوەڵان لەزانست وکردار،بە منداڵی موسوڵمان بووە لەگەڵ باوکی، یەکەم جار لە جەنگی خەندەق بەشداری کرد،وە بەشداری جەنگەکانی بەدری گەورەو ئوحود نەکرد چونکە هێشتا بچووك بوو .

پێشەوا مالیکی کوڕی ئەنەس(ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت) دەڵێ:عەبدوللای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لەسەر بێت)لەدوای وەفاتی پێغەمبەر(درود وسەلامی خوای لەسەر بێت)شەست ساڵ ژیا، لە هەموو شوێنێك وەفد ڕووی تێدەکرد بۆ وەرگرتنی زانست و فەرموودە وفەتوا، لە ساڵی حەفتا وسێ ٧٣ ی کۆچی وەفاتی کرد.

## سوودو پەندەکان

١. دروست نیە قورئان لەگەڵ خۆت ببەیت بۆ ناو زۆنی بێ باوەڕان ئەگەر لەوە ترسای کە بیدڕێنن ، یان فڕێی بدەن ، یان بیسوتێنن ، بەڵام ئەگەر لەوە دڵنیا بووی لەوەی کە هیچی لێ ناکەن ئەوا دروستە لەگەڵ خۆتی ببەی بۆ گەشتەکەت بۆ زۆنی بێ باوەڕان .

## الحديث التاسع عشر: فەرموودەی نۆزدەیەم

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) « إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ مِنَ اللَّيْلِ، فَاسْتَعْجَمَ الْقُرْآنُ عَلَى لِسَانِهِ فَلَمْ يَدْرِ مَا يَقُولُ، فَلْيَضْطَجِعْ »

**ئەبو هورەیرە(خوا لێی ڕازی بێت) فەرموویەتی:پێغەمبەری خوا (درود و سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی:هەر یەكێك لە شەو هەڵسا بۆ شەونوێژكردن بەڵام زوبانی قورس بوو بۆ قورئان خوێندن بەهۆی باوەشكێكی ئاسایی یان باوەشكێكی زۆر، و نەیزانی چی دەڵێت با بخەوێتەوە )).**

## تەخریج

أخرجه مسلم في كتاب صلاة المسافرين وقصرها ، بَابُ:(أَمْرِ مَنْ نَعَسَ فِي صَلَاتِهِ، أَوِ اسْتَعْجَمَ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ، أَوِ الذِّكْرُ بِأَنْ يَرْقُدَ، أَوْ يَقْعُدَ حَتَّى يَذْهَبَ عَنْهُ ذَلِكَ)،(رقم الحديث٢٢٣ - (٧٨٧) (ص٣٥٥)، وأبو داود في كتاب الصلاة ،بَابُ:(النُّعَاسِ فِي الصَّلَاةِ)،(رقم الحديث:١٣١١)، (ص٢٠٤)،صححه الألباني في صحيح سنن أبي داود (٣٥٩/١)،وابن ماجة في كتاب إقامة الصلوات والسنة فيها،بَابُ:(مَا جَاءَ فِي الْمُصَلِّي إِذَا نَعَسَ) (رقم الحديث:١٣٧٢)،(ص٢٤٣) ، صححه الألباني في صحيح سنن ابن ماجة (رقم الحديث:١١٣٨)(٤٠٩/١)،وأحمد بن حنبل في مسنده ، في مسند أبي هريرة(رضي الله عنه)(رقم الحديث:٨٢٣١)، والنسائي في السنن الكبرى في كتاب فضائل القرآن،بَابٌ:(مَنِ اسْتَعْجَمَ الْقُرْآنُ عَلَى لِسَانِهِ) (رقم الحديث:٧٩٩٠)(٢٦٨/٧)والبيهقي

في السنن الكبرى في كتاب الصلاة ،بَابٌ:(مَنِ اسْتَعْجَمَ الْقُرْآنُ عَلَى لِسَانِهِ) (٤٧٩٣)(٣٩١/٥)

وابن حبان في كتاب الصلاة، باب:(ذِكْرُ الْبَيَانِ بِأَنَّ مَنِ اسْتَعْجَمَ عَلَيْهِ قِرَاءَتُهُ بِاللَّيْلِ مِنَ النُّعَاسِ أَوِ النَّهَارِ كَانَ عَلَيْهِ الانْفِتَالُ مِنْ صَلَاتِهِ)،(رقم الحديث:٢٥٨٥)،(ص٧٤٨)،وعبدالرزاق الصنعاني باب :(الرجل يلتبس عليه القرآن في الصلاة)،(رقم الحديث:٤٢٣٢)(٣٢٩/٢)،والبغوي في شرح السنة في كتاب الصلاة،(أَبوابُ النَّوَافِلِ)،بَابُ:(تَرْكِ الْعَمَلِ عِنْدَ غَلَبَةِ النَّوْمِ وَالْفُتُورِ)(رقم الحديث:٩٤١) (٣٣/٣)

## سوودو پەندەكان

١. لەكاتی باوەشكت هات ئینجا باوەشكێكی ئاسایی بێت یان باوەشكێكی زۆر ، دروست نیە قورئان بخوێنی نەوەك بە هەڵە قورئان بخوێنی و بە خۆت نەزانی ، هەروەها دروست نیە نوێژ بكەی چونكە بیروهۆشت لای نوێژەكە نیە ، وە هەروەها دروست نیە شەونوێژ بكەی چونكە زمانت قورس دەبێت و تەركیزت نامێنێت ،لەوانەیە جوێن بەخۆت بدەیت وئاگات لە خۆ نەبێت.

٢. لە كاتی باوەشك هاتنەوە مرۆڤ زمانی قورس دەبێت ، وە بواری هەڵەكردن زۆرتر دەبێت بۆ قورئان خوێندنەوەكەی.

## الحديث العشرون: فەرموودەی بیستەم

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْـنِ مَسْـعُودٍ(ﷺ )، قَـالَ: قَـالَ لِي النَّبِـيّ (ﷺ ): ‹ اقْ رَأْ عَـلَ ›،

قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، آقْرَأُ عَلَيْـكَ، وَعَلَيْـكَ أُنْـزِلَ، قَـالَ ‹ نَعَـ » فَقَـرَأْتُ سُـورَةَ النِّسَاءِ حَتَّى أَتَيْتُ إِلَى هَـذِهِ الآيَـةِ: ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾ ﴾ [النساء ١: ]، قَالَ ‹ حَسْبُكَ الآ » فَالْتَفَـتُّ إِلَ هِ، فَإِذَا عَيْنَاهُ تَذْرِفَانِ .

عەبـــدوڵڵای کـــوڕی مەســـعود (خـــوا لێـــی ڕازی بێت)فــــەرمووی :پێغەمبەر(درووودو سەلامی خـوای لـە سـەر بێت)فـەرمووی: هەنـدێ قورئـــانم بەســـەردا بخوێنـــە،گوتم:قوربان! قورئـــان بەســـەر تـــۆدا دابــەزیوە، چـۆن مـن لەســەر تـۆدا بخـوێنم؟!، پێغەمبــەر(درووودو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: بەڵێ حـەز دەکـەم کەسـێکی تر لەسەرم بخوێنێت، وە منیش گوێی لێی بگرم ، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (خـوا لێـی ڕازی بێت)فـەرمووی: منـیش سـوڕەتی نیسـائم بـۆی خوێنـد تـا گەیشـتمە ئایـەتی ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾ ﴾﴿النســاء: ٤١﴾ ،پێغەمبــەر (درووودو ســەلامی خــوای لەســەر بێــت) فــەرمووی:ئیتر بەســـە، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود(خوا لێـی ڕازی بێت)فەرمووی:کـە سـەرم هــەڵبڕی تەماشـام کـرد، پێغەمبـەر (درووودو سـەلامی خـوای لەسـەر بێت)هۆن هۆن فرمێسك بە چاوە موبارەکەکانی دەهاتە خوارەوە .

## تەخریج

أخرجه البخاري كتاب التفسير بَابُ ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ۝٤١ ﴾ [النساء: ٤١] " (رقم الحديث:٤٥٨٢) (ص١١٣٨)،ومسلم في كتاب صلاة المسافرين وقصرها ،بَابُ:(فَضْلِ اسْتِمَاعِ الْقُرْآنِ، وَطَلَبِ الْقِرَاءَةِ مِنْ حَافِظِهِ لِلاسْتِمَاعِ وَالْبُكَاءِ عِنْدَ الْقِرَاءَةِ وَالتَّدَبُّرِ)،(رقم الحديث:٢٤٧ - ٨٠٠)(ص٣٦٠)،وأبو داود في كتاب العلم، بَابٌ:( فِي الْقَصَصِ)،(رقم الحديث:٣٦٦٨)(ص٥٥٥).صححه الألباني في صحيح سنن أبي داود (٤١٣/٢)، والترمذي في كتاب القراءات عن رسول الله (ﷺ)، بَابٌ:(وَمِنْ سُورَةِ النِّسَاءِ) ، (رقم الحديث:٣٠٢٥)(ص٦٧٦)، صححه الألباني في صحيح سنن الترمذي (٢١٧/٣)،وابن أبي شيبة في كتاب فضائل القرآن، باب:(فِي قِرَاءَةِ النَّبِيِّ (ﷺ)عَلَى غَيْرِهِ ،(رقم الحديث :٣٠٢٩٤)(١٥٥/٦)،والنسائي في السنن الكبرى في كتاب فضائل القرآن ،باب:(قَوْلُ الْمُقْرِئِ لِلْقَارِئِ: أَمْسِكْ)(رقم الحديث:٨٠٢٥)(٢٨٣/٧)،والبيهقي في شعب الإيمان، بابٌ:(فِي تَعْظِيمِ الْقُرْآن) فَصْلٌ:(فِي الْبُكَاءِ عِنْدَ قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ ) (رقم الحديث: ١٨٩٠)(٢١١/٤)، والبيهقي في السنن الكبرى في كتاب الشهادات بابُ:(الْبُكَاءِ عِندَ قِراءَةِ الْقُرآنِ )، (رقم الحديث:٢١٠٩٩)(١٦٧/٢١)،وأبو يعلي الموصلي في مسنده، في (مُسْنَدُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ) (رقم الحديث:٤٩٩٨)(٣٣٤/٤)،والبغوي في شرح السنة في كتاب فضائل القرآن، بَابُ:( سَمَاعِ الْقُرْآنِ)، (رقم الحديث: ١٢٢٠) (٢٦٩/٣)

## سوودو پەندەکان

١. یەكێك قورئانت بەسەردا بخوێنیێ كاریگەری زۆر زیاترە لەوەی خۆت قورئان بۆ خۆت بخوێنیت.

٢. ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودو سەلامی خوای لەسەر بێت)داوای لە غەیری خۆی كردبێت قورئانی بەسەردا بخوێنرێت ، غەیری ئەو زۆر ئەولاترە .

٣. پێغەمبەری خوا (دروودو سەلامی خوای لەسەر بێت)فەرمووی: تامەزرۆم قورئانم گوێ لێ بێت لە غەیری خۆم .

٤. لە كاتی تەواوبوونی قورئان سوونەتە بە بەرامبەرەكەت بفەرمووی : (حسبك)

٥. كاریگەری قورئان لە سەر پێغەمبەری خوا (دروودو سەلامی خوای لەسەر بێت)كە وای لێ كرد فرمێسكی موبارەكی بڕژێتە خوارەوە

## الحديث الحادي والعشرون

## فەرموودەی بیست ویەکەم

عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ السُّلَمِيِّ، عَـنْ عُـثْمَانَ بْـنِ عَفَّـانَ(ﷺ)، عَـنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: " خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ "

**ئەبو عەبدولرەحمانی سولەمی دەگێڕتەوە:کە پێشەوا عوسمانی کوڕی عەففان(خوا لێی ڕازی بێت)فەرموویەتی:پێغەمبەری خوا(درودو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: باشترینتان(لە دەستەواژەیەکی تردا – بێ گومان چاکترینتان) ئەو کەسەیە کە خۆی فێرە قورئان بکات بە ڕەوانی و ئەویش خەڵکی فێرە قورئان بکات)**

## تەخریج

أخرجه البخاري في كتاب فضائل القرآن، بَابٌ:(خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ القُرْآنَ وَعَلَّمَهُ) ، (رقم الحديث:٥٠٢٧) ، (ص١٢٩٩)،وأبو داود في كتاب (فضائل القرآن)، بَابٌ:(فِي ثَوَابِ قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ)،(رقم الحديث:١٤٥٢) ، (ص٢٢٥)، صححه الألباني في صحيح سنن أبي داود (١/٤٠٠)،والترمذي في كتاب ثواب القرآن ، بَابُ:(مَا جَاءَ فِي تَعْلِيمِ القُرْآنِ) (رقم الحديث: ٢٩٠٧) (ص٦٥٠) ، قال أبو عيسى:هذا حديث حسن صحيح ، صححه الألباني في صحيح سنن الترمذي (١٦٢/٣)،وابن ماجة في كتاب المقدمة بَابُ:(فَضْلِ

مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ) ، (رقم الحديث:٢١١) (ص٥٤)، صححه الألباني في صحيح سنن ابن ماجة (رقم الحديث:١٧٧) (٨٩/١)،ابن حبان في صحيحه في كتاب العلم باب:( ذِكْرُ الْبَيَانِ بِأَنَّ مِنْ خَيْرِ النَّاسِ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ)،رقم الحديث:١١٨) ،(ص١٤٤)،والبيهقي في شعب الإيمان فَصْلٌ فِي تَعَلُّمِ الْقُرْآنِ ،(رقم الحديث:١٧٨٥) (١١٣/٤)،والنسائي في السنن الكبرى في كتاب فَضائِلِ القُرْآن بابُ:(فَضْلُ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ) (رقم الحديث:٧٩٨٣)(٢٦٦/٧)،والدارمي في كتاب فَضائِلِ القُرْآن، بَابُ: خِيَارُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ ،(رقم الحديث:٣٢١٦) ،(٨٩٤/٢)والبيهقي في السنن الصغير كتاب فضائل القرآن ، بَابُ (التَّرْغِيبِ فِي تَعَلُّمِ الْقُرْآنِ وَتَعْلِيمِهِ وَتِلَاوَتِهِ )،(رقم الحديث:٩٥٨)(٢٦٥/١)،والبغوي في شرح السنة في كتاب فَضائِلِ القُرْآن، بَابُ:(فَضْلِ تَعَلُّمِ الْقُرْآنِ وَتَعْلِيمِهِ)، (رقم الحديث: ١١٧٢) (٢٣٤/٣)،وابن أبي شيبة في كتاب فضائل القرآن باب:(فِيمَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ) (رقم الحديث: ٣٠٠٦٢)(١٣٣/٦)،وأبو يعلي في مسنده ، مُسْنَدُ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (رقم الحديث:٨١٠)(٣٣٩/١)

وفي رواية ( إِنَّ أَفْضَلَكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ )

أخرجه ابن ماجة في كتاب المقدمة ، بَابُ:(فَضْلِ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ)، (رقم الحديث: ٢١٢)(ص٥٤)، صححه الألباني في صحيح سنن ابن ماجة (رقم الحديث:١٧٦) (٨٩/١)،والنسائي في السنن الكبرى في كتاب فَضائِلِ القُرْآن فَضْلُ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ (رقم الحديث: ٧٩٨٣)(٢٦٦/٧)،والبيهقي في شعب الإيمان بابُ:(فِي تَعْظِيمِ القُرآن)، فَصْلٌ :(فِي تَعَلُّمِ الْقُرْآنِ) (رقم الحديث: ١٧٨٤) (١١٣/٤)،والبيهقي في السنن الصغير ،في كتاب فضائل القرآن ، بَابُ :(التَّرْغِيبِ فِي تَعَلُّمِ الْقُرْآنِ وَتَعْلِيمِهِ وَتِلَاوَتِهِ) ، (رقم الحديث:٩٥٧)(٢٦٥/١)،وعبدالرزاق الصنعاني في كتاب فَضائِلِ القُرْآن، بَابُ:( تَعْلِيمِ الْقُرْآنِ وَفَضْلِهِ) ،(رقم الحديث: ٦٠١٤) (٢٢٥/٣)

## ژیانی پێشەوا عوسمانی كوڕی عەففان( خوا لێی ڕازی بێت )

عوسمانی کوڕی عەففانی کوڕی ئەبولعاسی کوڕی ئومەییەیە ، شەش ساڵ دوای ساڵی فیل لە مەدینە لە دایك بووە ، لەسەر دەستی ئەبو بەکری سدیق موسوڵمان بووە سێهەم خەلیفەی راشدینە ، بە زولنورین ناوبانگی دەرکردوە چونکە دوو کچی پێغەمبەری هێناوە کە ڕوقیە و ئوم کەلسومە ، پێشەوا عوسمان لە هەژدەی زولحیجە ی ساڵی سی وپێنج شەهید کرا

## سوودو پەندەکان

١. چاکترینی ئوممەتی پێغەمبەر (درودو سەلامی خوای لە سەر بێت) مامۆستایەکە کە قورئان بە خەڵکی بڵێ .
٢. فەزڵی قورئان خوێندن .
٣. فەزڵی قورئان خوێندنەوە .
٤. دەبێت قورئان بە ڕەوانی فێر بیت لۆ ئەوەی بە ڕەوانی بیلێیتەوە .

## الحديث الثاني والعشرون

# فەرموودەی بیست ودووەم

قالَ: أَبُو الطُّفَيْلِ عَامِرُ بْنُ وَاثِلَةَ(ﷺ ): أَنَّ نَافِعَ بْـنَ عَبْـدِ الْحَـارِثِ الخُزاعِيِّ(ﷺ ) تَلَقَّى عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ(ﷺ )إِلَى ؛ سْـفَانَ وَكَـانَ نَـافِعٌ عَاملا لعُمَرَ(ﷺ )عَلَى مَكَّـةَ،فَقَالَ عُمَـرُ (ﷺ ): مَـنِ اسْـتَخْلَفْتَ عَـلَى أَهْـلِ الْـوَادِي؟ يَعْنِـي أَهْـلَ مَكَّـةَ، قَـالَ:ابْنَ أَبْزَى،قَـالَ: وَمَـنِ ابْـنُ أَبْزَى؟،قَالَ:رَجُلٌ مِنَ الْمَوَالِي، قَالَ عُمَرُ:اسْتَخْلَفْتَ عَ يهِمْ مَوْلًى؟،فَقَالَ لَهُ:إِنَّهُ قَارِئٌ لِكتَابِ اللَّـه، فَقَـالَ: أَمَـا إِنَّ نَبِـيَّكُمْ (ﷺ )،قَـالَ « إِنَّ اللَّـهَ لَيَرْفَعُ بِهَذَا الْقُرْآنِ أَقْوَامًا، وَيَضَعُ بِهِ آخَرِينَ ».

ئەبو توفەیل عامری کوڕی واسیلەی لەیسی (خـوا لێـی ڕازی بێـت) دەڵێ: نافیعی کوڕی عەبدولحاریسی خوزاعی(خوا لێی ڕازی بێت) بە پێشەوا عومـەری کـوڕی خـەتتاب (خـوا لێـی ڕازی بێت)گەیشـت بـۆ عوسفان، نـافیعی کـوڕی عەبدولحاریسـی خـوزاعی (خـوا لێـی ڕازی بێت) والی مەککە بوو لە سەردەمی پێشەوا عومەری کوڕی خـەتتاب (خوا لێی ڕازی بێت) .

پێشـــەوا عومـــەری کـــوڕی خـــەتتاب(خوا لێـــی ڕازی بێـــت) پێـــی فەرموو:کێت کردووە بە والی لەسەر ئەهلولوادی (واتە شاری ئەهواز کە ئێستا لە ئێرانە)، ووتـی: عەبدولڕەحمانی کوڕی ئـەبزا ، پێشـەوا

عومـــەری کـــوڕی خـــەتتاب (خـــوا لێـــی ڕازی بێـــت) فـــەرمووی: عەبــدولڕەحمانی کــوڕی ئــەبزا کــێ یــە ؟ ، ووتـــی :یەکێکــە لــە خولامـەکانمان ، پێشـەوا عومـەری کـوڕی خـەتتاب (خـوا لێـی ڕازی بێت): خولاّمێکت کردووە بـە والی،ووتـی :قورئـانی پـیرۆزی هـەموو لەبەرە، وپسـپۆرە لـە زانسـتی مـیرات،وە قازیشە،پێشـەوا عومـەری کوڕی خەتتاب(خوا لێی ڕازی بێت) فەرمووی:دەنا پێغەمبەرەکـەتان (درووودو ســەلامی خــوای لەســـەر بێـــت) فەرموویـــەتی: خـــودای پەروەردگار پلەو پایەی چەندها نەتەوە بەرز دەکاتەوە بە هۆی ئەو قورئانە چونکە پەیڕەویان کردووە ، وە پلەو پایەی چەندها نەتەوە نزم دەکاتەوە ودادەبەزێنی بە هۆی ئەو قورئانە چونکە پشتیان تێ کردووە .

## تەخریج

أخرجه مسلم في كتاب صلاة المسافرين وقصرها بَابُ:(فَضْلِ مَنْ يَقُومُ بِالْقُرْآنِ، وَيُعَلِّمُهُ، وَفَضْلِ مَنْ تَعَلَّمَ حِكْمَةً مِنْ فِقْهٍ، أَوْ غَيْرِهِ فَعَمِلَ بِهَا وَعَلَّمَهَا)،(رقم الحديث:(٢٦٩ -(٨١٧) (ص٣٦٥)،وابـن ماجـة في كتـاب المقدمـة بَابُ:(فَضْـلِ مَـنْ تَعَـلَّمَ الْقُـرْآنَ وَعَلَّمَـهُ)،(رقم

الحـديث :٢١٨) (ص٥٥)،صححـه الألبـاني في صحـيح سـنن ابـن ماجـة (رقم الحـديث:١٨٠)(٩٠/١)، وأحمـد في مسـنده في مسـند عمـر بـن الخطـاب(رضي الله عنه) (٣٥٥/١)،والبزار في مسند البحر الزخار في مسند عمر بن الخطاب(رضي الله عنه)(ومما روى أبـو الطفيـل(رضي الله عنه) عـن عمـر بـن الخطـاب(رضي الله عنه)(رقم الحـديث:٢٤٩)(٣٧١/١)،وابـن حبان في كتاب الرقائق،باب:(ذِكْرُ الْبَيَانِ بِأَنَّ الْقُرْآنَ يَرْتَفِعُ بِهِ أَقْوَامٌ وَيَتَّضِعُ بِهِ آخَـرُونَ عَلَى حَسَبِ نِيَّاتِهِمْ فِي قِرَاءَتِهِمْ)،(رقم الحـديث:٧٧٢)(ص٣١٦)، والدارمي في كتاب فضائل القـرآن ،بَابُ:(إِنَّ اللَّهَ يَرْفَـعُ بِهَـذَا الْقُـرْآنِ أَقْوَامًـا وَيَضَـعُ آخَـرِينَ) (رقم الحـديث:٣٢٤٢) (٩٠٠/٢)،والبغـوي في شرح السـنة في كتـاب فضـائل القـرآن ، باب:(فَضْـلُ حِفْـظِ الْقُرْآنِ)(١١٨٤) (٢٤٢/٣)

## کورتەی ژیانی پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب ( خوا لێی ڕازی بێت )

١. **ناوی عومەری کوڕی خەتتاب کوڕی نوفـەیل کـوڕی عەبـدی عـوززای عەدەوی قوڕەیشیە، لە (کەعبـی کـوڕی) لوئـەی دەگاتـە پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەر بێت)**
٢. **کونیەکەی : ئەبو حەفص (باوکی شێر)**
٣. **لەقەبەکەی : (الفاروق) واتـە جیاکـەرەوە لـە نێـوان هـەق و بـەتاڵ، کاری بڕواداران پێش هاتنە ڕیزی بـڕواداران زۆر شـاراوە بـوو، بـەڵام دوای هاتنە ڕیزی بڕواداران زۆر ئاشکرا بوو .**

٤. دوای چل پیاو و یازدە ئافرەت لە ساڵی شەشەمی ئیعلان کردنی پێغەمبەرایەتی موحەممەد (درودی خوای لەسەر بێت) شاهیدی هێناوە وە بووەتە بڕوادار .

٥. لە رۆژی سێشەممە ی بیست ویەکی جەمادی یەکەمی ساڵی سێزدەی کۆچی، دوای کۆچی دوایی جێنشینی یەکەم (ئەبوبەکری صدیق)(خوا لێی ڕازی بێت) بەیعەتی پێدرا بۆ خیلافەت .

٦. لە ڕۆژی چوارشەممە ی چواری ژی الحجە ساڵی بیست وسێ ی کۆچی بە دەستی چەپەڵی ئەبو لؤلؤەی فەیروز شەهید کرا لە تەمەنی شەست و سێ ساڵی .

٧. یەکەم جێنشینە کە پێی بووترێت ئەمیری بڕواداران،لەو کاتەوە بە خەلیفەی بڕواداران دەووترا ئەمیری بڕواداران، هەر وەك چۆن بە گەورەی ڕۆمەکان دەوترا هیرەقل، وە بە گەورەی فورسەکان دەوترا کیسرا،وە بە گەورەی میسرپیەکان دەوترا فیرعەون،وەبە گەورەی حەبەشیەکان دەوترا نەجاشی،وەبە گەورەی یەمەنیەکان دەوترا توببەع.

٨. یەکەم کەسە کە بڕوادارانی کۆکردۆتەوە بۆ ئەداکردنی نوێژی تەڕاویح بە جەماعەت هەموو مانگی ڕەمەزان وە لە مزگەوت .

٩. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيّ(رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): «إِنَّ أَهْلَ الدَّرَجَاتِ الْعُلَى لَيَرَاهُمْ مَنْ تَحْتَهُمْ كَمَا تَرَوْنَ النَّجْمَ الطَّالِعَ فِي أُفُقٍ مِنْ آفَاقِ السَّمَاءِ، وَإِنَّ أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ مِنْهُمْ، وَأَنْعَمَا» .[1]

**ئەبوسەعیدی خودری (خوا لێـی ڕازی بێـت)دەڵێ :پێغەمبـەری خـوا (درودی خوای لەسـەر بێـت) فەرموویـەتی :(بـێ گومـان کەسـە پلـە بەرزەکانی بەهەشت دەبینرێن لـە لایـەن خـوار خۆیانـەوە هـەر وەك چـۆن ئەسـتێرەیەکی درەوشـاوە دەبیـنن لـە پانتاییـەك لـە پانتاییەکانی ئاسمان، وە بێ گومان ڤـهـردوو پێشـەوا ئەبوبـەکر و عومەر ( خوا لێ یان ڕازی بێت) لەو کەسانەن**

(١)أخرجه الترمذي في السنن (٣٦٥٨)(ص٨٣١)فقال الترمذي:هذا حديث حسن،وقال الألباني:حديث صحيح، وابن ماجة(٩٦) (ص٣٣) وقال الألباني:صحيح ، أحمد في المسند(١١٢١٣)(٢١٣/١٧)وقال شعيب الأرنؤوط: حسن لغيره)، وأبو يعلي الموصلي في مسنده -(١١٢٥) (٤٧٨/١) و(١٢٩٤)(٥٤٨/١) في مسند أبي سعيد الخدري

١٠. عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ(رضي الله عنه) ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): "إِنِّي لا أَدْرِي مَا قَدْرُ بَقَائِي فِيكُمْ، فَاقْتَدُوا بِاللَّذَيْنِ مِنْ بَعْدِي"، وَأَشَارَ إِلَى أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ)) [1]

**حوزەیفەی کوڕی یەمان دەڵێ: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: (من نازانم چەند لەناوتان دەمێنمەوە، بۆیە شوێنکەوتەی ئەو دوو پێشەوایە بن لە دوای خۆتان، ئیشارەتی کرد بۆ هەردوو پێشەوا ئەبوبەکر و عومەر ( خوا لێ یان ڕازی بێت).**

١١. عَنْ عَلِيٍّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): "أَبُو بَكْرٍ(رضي الله عنه) وَعُمَرُ(رضي الله عنه) سَيِّدَا كُهُولِ أَهْلِ الْجَنَّةِ مِنْ الْأَوَّلِينَ وَالْآخِرِينَ، إِلَّا النَّبِيِّينَ وَالْمُرْسَلِينَ،)) [2]

**پێشەوا عەلی(خوا لێ ی ڕازی بێت) دەڵێ:پێغەمبەری خوا(درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی :(دوو پێشەوا ئەبوبەکر**

(١)أخرجه الترمذي في كتاب باب(في مناقب أبي بكر وعمر (رضي الله عنهما) كليهما):(٣٦٦٢)(ص٨٣٢) وقال الألباني(صحيح)، وابن ماجة في كتاب المقدمة باب(فضائل أصحاب رسول الله (صلى الله عليه وسلم)) (٩٧) (ص٣٣) وقال الألباني (صحيح)،وأحمد في المسند(٢٣٢٧٦)(٣٠٩/٣٨) وقال شعيب الأرنؤوط:حديث حسن بطرقه وشواهده)، والطبراني في المعجم الأوسط(٣٨١٦)(٤٣/٣)،وصححه الألباني في (سلسلة الأحاديث الصحيحة)(١٢٣٣) (٢٣٣/٣)

(٢)أخرجه الترمذي في كتاب المناقب عن رسول الله(صلى الله عليه وسلم)باب(في مناقب أبي بكر وعمر(رضي الله عنهما) (٣٦٦٥)(ص٨٣٢)وقال الألباني (صحيح)،وابن ماجة في كتاب المقدمة باب(في فضائل أصحاب رسول الله(صلى الله عليه وسلم)) (٩٥) (ص٣٣)وقال الألباني(صحيح)،وابن حبان في صحيحه في باب(ذِكْرُ البَيان بأن الصديق رضي الله عنه والفاروق رضي الله عنه يكونان في الجنة سيدي كهول الأمم فيها)(٦٩٠٤)(٣٣٠/١٥)،والطبراني في المعجم الأوسط (٤٤٣١) (٢٣٢/٣)،وأبو يعلى الموصلي (٥٢٩) (٢٤٧/١)، وصححه الألباني في صحيح موارد الظمآن إلى زوائد ابن حبان)(١٨٣٩) (٣٤٦/٢)،وفي سلسلة الأحاديث الصحيحة (٨٢٤)(٤٦٧/٢)، وفي صحيح الجامع الصغير و زيادته (٥١)(٧١)

وعومەر(خوا لیٚ یان ڕازی بێت)سەرکردەوە پێشەوای بەهەشتیانن لە سەرەتای ئوممەتان تا کۆتایی ئوممەتان تەنها لە سەر پێغەمبەران نەبن

١٢. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ(رضي الله عنهما):كَانَ رَسُولُ اللهِ(صلى الله عليه وسلم) يَبْعَثُ رِجَالا إِلَى الْبُلْدَانِ يَدْعُونَ النَّاسَ إِلَى الإِسْلامِ، فَقَالَ رَجُلٌ: لَوْ بَعَثْتَ أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ.فَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم):«أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ لا غِنًى بِي عَنْهُمَا، إِنَّ أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ مِنَ الإِسْلامِ بِمَنْزِلَةِ السَّمْعِ وَالْبَصَرِ مِنَ الإِنْسَانِ»[1]

ئیبنول عەبباس(خوا لێیان ڕازی بێت)دەڵێ:پێغەمبەری خوا(درودی خوای لەسەر بێت)کەڵە پیاوانی بۆ وولاتان وشوینەکان دەنارد تا بانگەوازی ئیسلامیان پیٚ ڕابگەینێت، یەکێك ووتی: خۆزگە ئەو دوو پێشەوایەت دەنارد کە ئەبو بەکر وعومەرن(خوا لیٚ یان ڕازی بێت) پێغەمبەری خوا(درودی خوای لە سەر بێت)لە وەڵامدا فەرمووی:(ناتوانم دەستبەرداری ئەو دوو پێشەوایە ئەبو بەکر وعومەرن (خوا لیٚ یان ڕازی بێت) بم، چونکە ئەو دوو پێشەوایە ئەبو بەکر و عومەر (خوا لیٚ یان ڕازی بێت) وەك گویٚ و چاو وان بۆ مرۆڤ.).

(١)أخرجه الطبراني في المعجم الكبير (١٤١٣٩)(١٣٣/١٣)، وفي الطبراني في الأوسط (٤٩٩٩) (٤١٧/٣) وأبي نعيم الأصبهاني في حلية الأولياء وطبقات الأصفياء (٧٢/٤) صححه الألباني في السلسلة الأحاديث الصحيحة (٨١٥) (٤٥٧/٢)

پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێت)پێشەوا ئەبو بەکر (خوا لێ ڕازی بێت) بەگوێ چواندووە وەپێشەوا عومەر(خوا لێ ڕازی بێت)ی بە چاو چواندووە،وە ئەوەش مانای ئەوە دەگەیەنێت کە ئەوەی گوێی نەبێت تەکلیفی لەسەر نیە،وە ئەوەی کوێر بێ تەکلیفی لەسەرە،کەواتە پایەی پێشەوا ئەبو بەکر(خوا لێ ڕازی بێت)گەورەترە چونکە بە گوێ ی چواندووە لە پایەی پێشەوا عومەر (خوا لێ ڕازی بێت) کە بە چاو چواندووە .

## سوودو پەندەکان

١. قورئان بەندە و خوڵام بەرز دەکاتەوە بە پەیڕەوکردنیان بۆ قورئانەکە، وە کەسی ئازاد نزم دەکاتەوە بە پشتکردنیان لە قورئان .

٢. قورئان هەندێ نەتەوە بەرز دەکاتەوە لە بەینی نەتەوەکان بە هۆی پەیڕەوکردنیان ، وە هەروەها پلەیان بەرز دەکاتەوە لە بەهەشت.

٣. قورئان هەندێ نەتەوە نزم دەکاتەوە لە بەینی نەتەوەکان بە هۆی پشتکردیان لە قورئان.

٤. بـە هـۆی قورئـان لـە دونیـاو ئـاخیرەت سـەرفراز دەبیـت، وە بەهۆی پشتكردنت لە قورئان ، لـە دونیـاو ئـاخیرەت سەرشـۆڕ دەبیت.

٥. پـەیڕەوكردنی قورئـان واتـە جـێ بـەجێكردنی فەرمانـەكانی،و نەكردنی قەدەغە كراوەكانی ، وە بە ڕاستدانانی هەواڵـەكانی و چیرۆكەكانی .

٦. قورئان بۆ ئەوە نەنێردراوە تا لەسەر گۆڕستان بخوێندرێت.

# الحديث الثالث والعشرون

# فەرموودەی بیست وسێیەم

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالك(رضي الله عنه)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "إِنَّ للَّه أَهْلِينَ منْ النَّاس. قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَنْ هُمْ؟ قَالَ: "هُمْ أَهْلُ الْقُرْآنِ، أَهْلُ اللَّهِ وَخَاصَّتُهُ"

ئەنەسی کوڕی مالیك(خوا لێی ڕازی دەبێت) فەرموویەتی: ((بێگومان خوای پەروەردگار ئەهلێکی لە خەڵکی هەیە،ووتیان:ئەی پێغەمبەری خوا(دروود وسەلامی خوای لەسەر بێت)ئەو ئەهلانە کێن؟ ،پێغەمبەری خوا(دروود وسەلامی خوای لەسەر بێت) فەرمووی:ئەوانە ئەهلی قورئانن ، وئەهلی تایبەتی خوای پەروەردگارن))

# تەخریج

أخرجه ابن ماجة في كتاب المقدمة بَابُ:(فَضْلِ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ)،(رقم الحديث:٢١٥)(ص٥٥)،صححه الألباني في صحيح سنن ابن ماجة (رقم الحديث: ١٨٠) (٩٠/١)،والنسائي في السنن الكبرى في كتاب فضائل القرآن ، بابُ:(أَهْلُ الْقُرْآنِ)،(رقم الحديث: ٧٩٧٧)(٢٦٣/٧)،والدارمي في كتاب فضائل القرآن،بَابُ: (فَضْلِ مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ)،(رقم الحديث: ٣٢٠٦) (٨٩١/٢)،وأحمد في المسند في مسند أنس(رضي الله عنه)(رقم الحديث:١٢٢٩٣) (٣٠٥/١٩)،والبيهقي في شعب الإيمان بابُ:(فِي تَعْظِيمِ القُرآن)، فَصْلٌ :(فِي تَنْوِيرِ مَوْضِعِ الْقُرْآنِ وَهَذَا لِأَنَّهَا مَوَاضِعُ تَشْهَدُهَا الْمَلَائِكَةُ فَمِنَ الْحَقِّ أَنْ يُنَوَّرَ وَيُطَيَّبَ)، (رقم الحديث :٢٤٣٤) (١١٥/٥)



## كورتەی ژیانی ئەنەسی كوڕی مالیك ( خوا لێ ی ڕازی بێت )

ئەنەسی كوڕی مالیكی كوڕی نەزر،ئەبو حەمزەی ئەنساڕی خەزرەجی، خزمەتكاری پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت)،دوو هەزارو دووسەدو هەشتاو شەش فەرمودەی لە پێغەمبەر(دروودی خوای لە سەر بێت) ڕیوایەت كردووە،ئوم سولەیم كچی میلحان دایكی ئەنەسی كوڕی مالیك هاتە لای پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێت) وئەنەسی لەگەڵ خۆی هێنا بوو كە تەمەنی دە ساڵ بوو بە پێغەمبەری(درودی خوای لەسەر بێت)فەرموو:ئەمە ئەنەسە،خوڵامتە با خزمەتت بكات،وە پێغەمبەریش(درودی خوای

لەسەر بێت)ماچی کرد وە دوعای بۆ کرد وفەرمووی((ئەی خودای پەروەردگار ماڵ وسامانی زیاد بکە وبیخەرە بەهەشت))، ئەنەسی کوڕی مالیك فەرمووی:من دووانم بینی وچاوەڕوانی سێهەمم،وە بەردەوام بوو لە خزمەتکردنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت)تا پێغەمبەری(درودی خوای لەسەر بێت)وەفاتی کرد،دواتر لە مەدینە مایەوە، دواتر چوو بۆ بەسرە،تا لەوێ وەفاتی کرد لە ساڵی نۆهەدی کۆچی .

## سوودو پەندەکان

ئەهلی قورئان ئەهلی خوای پەروەردگارن کە

- گرنگی تەواو بە قورئان دەدەن
- گرنگی بە ووردبوونەوە لە تێگەیشتنی دەدەن
- گرنگی بە جوان خوێندنەوەو ڕەوان خوێندنەوە دەدەن
- گرنگی بە فێرکردنی خەڵکی دەدەن
- گرنگی بە ئەزبەرکردنی قورئان دەدەن
- گرنگی بە پەیڕەوکردنی قورئان دەدەن
- ڕۆژانە هەندێکی لێ دەخوێنن و هەجری ناکەن

# الحديث الرابع والعشرون

## فەرموودەی بیست وچوارەم

عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ:قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ ):« يُقَالُ لِصَاحِبِ الْقُرْآنِ اقْرَأْ وَارْتَقِ وَرَتِّلْ كَمَا كُنْتَ تُرَتِّلُ فِي الدُّنْيَا، فَإِنَّ مَنْزِلَتَكَ عِنْدَ آخِرِ آيَةٍ تَقْرَؤُهَ ».

**عەبدوللای كوڕی عەمر(خوا لێیان ڕازی بێت)فەرمویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی:بەو كەسە دەوترێت كە پەیڕەوی قوڕئانی كردووە:بخوێنەوە ، وپلە پلە بەرزبەوە،وە بە تەرتیلێكی جوان بیخوێنەوە هەر وەك چۆن لە دونیا دەتخوێندەوە ، مەنزڵگەت لە دوا ئایەتە كە دەیخوێنیتەوە ))**

## تەخریج

أخرجه أبو داود في كتاب الصلاة ،بَابُ:(اسْتِحْبَابِ التَّرْتِيلِ فِي الْقِرَاءَةِ) ،(رقم الحديث :١٤٦٤)(ص٢٢٧)،صححه الألباني في صحيح سنن أبي داود(٤٠٣/١).والترمذي في كتاب ثواب القرآن ، باب:() ،(رقم الحديث: ٢٩١٤)(ص٦٥١)، قال أبو عيسى : هذا حديث حسن صحيح ،حسنه الألباني في صحيح سنن الترمذي(١٦٥/٣)،واحمد في المسند(رقم الحديث:٦٧٩٩)(٤٠٣/١١)، والبيهقي في باب: (فِي تَعْظِيمِ الْقُرْآن)، فَصْلٌ:(فِي إِدْمَانِ تِلَاوَةِ الْقُرْآنِ)،(رقم الحديث:١٨٤٤)، (١٧٤/٤)،والبيهقي في السنن

الصغير في كتاب فضائل القرآن، بَابٌ:(فِي تَرْتِيلِ الْقُرْآنِ وَتَحْسِينِ الصَّوْتِ بِهِ)(رقم الحديث:١٠٠٤)(٢٧٩/١)،وابن أبي شيبة في كتاب فضائل القرآن ،باب :(مَنْ قَالَ لِصَاحِبِ الْقُرْآنِ: اقْرَأْ وَارْقَهُ)،(رقم الحديث : ٣٠٠٤٦)(١٣١/٦)، والبغوي في كتاب فضائل القرآن ،بَابُ:(فَضْلِ تِلاوَةِ الْقُرْآنِ)(رقم الحديث:١١٧٨) (٢٣٩/٣)وابن حبان في كتاب الرقائق،بابُ:(ذِكْرُ الْبَيَانِ بِأَنَّ آخِرَ مَنْزِلَةِ الْقَارِئِ فِي الْجَنَّةِ تَكُونُ عِنْدَ آخِرِ آيَةٍ كَانَ يَقْرَؤُهَا فِي الدُّنْيَا) ، (رقم الحديث:٧٦٦)،(ص٣١٤).

## سوودو پەندەکان

**١. بە خوێندنەوەی قورئان وکارپێکردنی پلەت لە بەهەشت بەرز دەبێتەوە .**

**٢. هەندێك لە زانایان فەرموویانە کە پلەکانی بەهەشت بە گوێرەی ژمارەی ئایەتەکانی قورئانە .**

**٣. ئەم فەرمودەیە مەبەستی ئەوە نیە کە یەکێك قورئانی ئەزبەر نەبێت ئەوا پلەی لە بەهەشت نزمتر دەبێت،بە بەڵگەی ئەوەی هەموو هاوەڵان (خوا لێ یان ڕازی بێت) هەموو قورئانیان ئەزبەر نەبوو،وە هەروەها بەڵگە نیە کە ئەوانەی قورئانیان هەموو ئەزبەر نەبێت پلەی بەرز بەدەست ناهێنن .**

**٤. هەر کەسێك قورئان بخوێنێتەوە بە ڕەوانی بەڵام کاری پێ نەکات ئەو فەزڵە نایگرێتەوە.**

# الحديث الخامس والعشرون

## فەرموودەی بیست وپێنجەم

عن عَبْد اللَّه بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيه (ﷺ)، عَنْ رَسُول اللَّه (ﷺ) قَالَ:" إِنَّ الْقُرْآنَ لَيَلْقَى صَاحِبَهُ حِينَ يَنْشَقُّ عَنْهُ قَبْرُهُ كالرَّجُلِ الشَّاحب،فَيَقُولُ: هَلْ تَعْرِفُني؟ فَيَقُولُ: لا أَعْرِفُكَ، فَيَقُولُ:أَنَا الْقُرْآنُ الَّذي أَظْمَأْتُ نَهَارَكَ، وَأَسْهَرْتُ لَيْلَكَ،وَإِنَّ كُلَّ تَاجِرٍ مِنْ وَرَاء تجارَتِه، وَإِنَّكَ الْيَوْمَ مِنْ وَرَاء كُلِّ تجارَة،فَيوضَعُ الْمُلْكُ بِيَمِينه،وَالْخُلْدُ بِشمَاله، وَيُوضَعُ تَاجُ الْوَقَارِ عَلَى رَأْسه، وَيُكْسَى وَالِدَاهُ حُلَّتَيْنِ لا يَقُومُ لَهُمَا أَهْلُ الدُّنْيَا، فَيَقُولانِ:بِمَ كُسِينَا هَذَا؟ فَيُقَالُ:بِ خْذِ وَلَدكُمَا الْقُرْآنَ، ثُمَّ يُقَالُ: اقْرَأْ وَاصْعَدْ فِي دَرَجِ الْجَنَّة وَغُرَفِهَا فَهُوَ فِي صُعُودٍ مَا دَامَ يَقْرَأُ هَذًّا كَانَ أَوْ تَرْتِيلا [١].

عەبدوڵڵای كوڕی بورەیدە لە باوكی دەگێڕێتەوە،وە باوكیشی كە بورەیدەیە لە پێغەمبەری خوا (درودو سەلامی خوای لەسەر بێت)دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((بێ گومان پاداشتی قورئان وەكو كەسێكی ڕەنگزەرد(ڕەنگپەڕیو) بە خاوەنەكەی دەگات لە كاتی زیندووبونەوە ولە ڕۆژی حەشر، پاداشتی قورئان بە خاوەنەكەی دەڵێت: ئایا دەمناسیتەوە؟ خاوەنەكەی دەڵێ: نەخێر

ناتناسمەوە، پاداشتی قورئان دەڵێ:من خاوەنەکەتم پاداشتی قورئانم،کە تینوتیتم شکاند لە ڕۆژی زۆر گەرم، وە شەوەکانتم زیندوو کردەوەو بەئاگام کردیی،وە هەموو بازرگانێك بەدوای بازرگانەکەیەتی، وە تۆش ئەورۆ لە دوای هەموو بازرگانیەکانی، مولك وسامانی به دەسته ڕاست دەدرێتێ، وە نەمری بە دەستە چەپ دەدرێتێ ، وەتاجی ڕێز وشکۆداری پێ دەبەخشرێ ولە سەر سەری دادنرێ، وە دایك و باوکی خشڵیان پێ دەبەخشرێ کە لە دونیا وەك ئەم خشڵە نمونەی نیە،دایك وباوکی دەڵێن: بەرامبەر چی ئەم خشڵەمان پێ بەخشرا ؟ وەڵامیان دەدرێتەوە :بە هۆی ئەوەی کوڕەکەتان قورئانی بە تەواوی ئەزبەر کردووە،دواتر پێی دەگوترێ: بخوێنەوەو بەرزبەوە بۆ پەیژەکان و پلەکانی بەهەشت ، وە بۆ ژوورەکانی ، بەردەوام لە بەرزبونەوەی پلەکانە تا قورئان بخوێنێ بە ئاسایی یان بە تەرتیل ))

## تەخریج

أخرجه البيهقي في شعب الإيمان في باب:(فِي تَعْظِيمِ القُرآن)، فَصْلٌ فِي إِدْمَانِ تِلَاوَةِ الْقُرْآنِ،(رقم الحديث:(١٨٣٥)(١٦٥/٤)،والدارمي في كتاب فضائل القرآن بَابُ: (فِي

فَضْلِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ وَآلِ عِمْرَانَ)(رقم الحديث:٣٢٦٨)(٩٠٧/٢)،وابن ابي شيبة في كتاب فضائل القرآن،باب:(مَنْ قَالَ:يَشْفَعُ الْقُرْآنُ لِصَاحِبِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ )، (رقم الحديث:٣٠٠٣٦)(١٣٠/٦)،وعبدالرزاق الصنعاني في مصنفه في كتاب فضائل القرآن،بَابُ:(تَعْلِيمِ الْقُرْآنِ وَفَضْلِهِ)(رقم الحديث:٦٠٣٤)(٢٢٩/٣)،والبغوي في كتاب فضائل القرآن بَابُ :(تَعْلِيمِ الْقُرْآنِ وَفَضْلِهِ)(رقم الحديث:١١٩٠)(٢٤٨/٣)

## ژیانی بورەیدەی کوڕی حوسەیب

بورەیدەی کوڕی حوسەیبی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی حاریسە ، کونیەکەی ئەبو عەبدوڵڵایە ، لەو کاتەی پێغەمبەر (دروودو سەلامی خوای لەسەر بێت) کۆچی دەکرد بەرەو مەدینە ،هاوەڵی پێغەمبەرە (دروودو سەلامی خوای لەسەر بێت)، ١٦٧ فەرمودەی لە پێغەمبەر (دروودو سەلامی خوای لەسەر بێت) گێڕاوەتەوە ، هەردوو کوڕەکەی عەبدوڵڵا و سولەیمان فەرمودەیان لێی گێڕاوەتەوە ، بەژداری کردوە لە جەنگی حودیبیە و پەیمانی ریزوان لە ژێر دارەکە ،لە دانیشتوانی مەدینە بوو ، دواتر چوو بۆ بەسرە ، هەر لەوێش خانویەکی دروست کرد ، دواتر بۆ جیهاد بەرەو خوراسان ڕۆیشت ، وە لە شاری مەڕو نیشتەجێ بوو ، تا هەر لەوێش وەفاتی کرد لە ساڵی شەست ودووی کۆچی .

## سوودو پەندەکان

١. پاداشتی قورئان دەبێتـە تکاکـار بـۆ خاوەنەکـەی لـە ڕۆژی قیامەت .

٢. پاداشتی قورئان لەسەر شێوازی ڕەنگزەرد – ڕەنگپـەڕیو– دێتە لای خاوەنەکەی لە ڕۆژی قیامەت ، چونکە ئەو کەسـە لە دونیا تا قورئانی لەبەر کرد ، خۆی ڕەنگزەرد کرد، چۆن لە دونیا ڕەنگـی زەرد هەڵگـەڕا تـا هـەموو قورئـانی هـەموو لەبـەر کـرد ، ئـاواش پاداشـتی قورئـان لەسـەر شـێوازی کەسێکی ڕەنگزەرد دێتە لای .

٣. تـاجی ڕێـز وشـکۆداری پـێ دەبەخشـرێ ولـە سـەر سـەری دادنرێ بەرامبەر لەبەرکردنی قوڕئان و کارپێکردنی.

٤. دایـك وبـاوکی سـوودمەند وشـەرەفمەند دەبـن بـە ئەزبـەر کردنی قورئان وپەیڕەوی کردنی لـە لایـەن کوڕەکـەیان یـان کچەکەیان.

# الحديث السادس والعشرون

# فەرموودەی بیست وشەشەم

عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ (ﷺ)،قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ):" إِنَّ مِنْ إِجْلالِ اللهِ إِكْرَامَ ذِي الشَّيْبَةِ وَحَامِلِ الْقُرْآنِ غَيْرِ الْغَالِي فِيهِ وَلا الْجَافِي عَنْهُ وَإِكْرَامَ ذِي السُّلْطَانِ الْمُقْسِطِ "

ئەبو موسای ئەشعەری (خوا لێی ڕازی بێت) فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا (دروودو سەلامی خوای لە سەر بێت) فەرموویەتی : (( بێگومان لە گەورەیی خوای پەروەردگار ڕێزگرتنیەتی لە موسوڵمانێکی بە تەمەن، وە ڕێزگرتنیەتی لە خاوەن قورئان نە زیادەڕەوی تیا بکات ، نە کەمتەرخەمی تیا بکات، وە ڕێزگرتنیەتی لە پادشایەکی دادپەروەر))

## تەخریج

أخرجه أبو داود في كتاب الأدب، بَابٌ :(فِي تَنْزِيلِ النَّاسِ مَنَازِلَهُمْ )(رقم الحديث: ٤٨٤٣)(ص٧٢٦)،حسنه الألباني في صحيح سنن أبي داود(١٨٩/٣)،والبيهقي في شعب الإيمان في باب:(فِي تَعْظِيمِ الْقُرْآنِ)، فَصْلٌ:(فِي تَنْوِيرِ مَوْضِعِ الْقُرْآنِ وَهَذَا لِأَنَّهَا مَوَاضِعُ تَشْهَدُهَا الْمَلَائِكَةُ فَمِنَ الْحَقِّ أَنْ يُنَوَّرَ وَيُطَيَّبَ)(رقم الحديث:٢٤٣٣)(١١٤/٥) ،وابن أبي شيبة في كتاب السير باب:(مَا جَاءَ فِي الْإِمَامِ الْعَادِلِ)(رقم الحديث:٣٢٥٥٢) (٤٢٤/٦)، والبيهقي في السنن الكبرى في كتاب:قتال أهل البغي، بَابُ (النَّصِيحَةِ لِلَّهِ وَلِكِتَابِهِ وَرَسُولِهِ وَلِأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ وَمَا عَلَى الرَّعِيَّةِ مِنْ إِكْرَامِ السُّلْطَانِ الْمُقْسِطِ) (رقم الحديث :١٦٧٣٦) (٥٨٣/١٦)

## سوودو پەندەکان

١. خوای پەروەردگار ڕێز لە پیرێکی موسوڵمان دەگرێت چونکە تەمەنی لە ناو ئیسلام سپی کردووە .

٢. خوای پەروەردگار ڕێز لە خاوەن قوڕئان ناگرێت کە زیادەڕەوی تیا بکات ،

٣. خوای پەروەردگار ڕێز لە خاوەن قوڕئان ناگرێت کە کەمتەرخەمی تیا بکات .

٤. خوای پەروەردگار ڕێز لە پادشای دادپەروەر دەگرێت.

٥. خوای پەروەردگار ڕێز لە پادشای ستەمکار ناگرێت.

# الحديث السابع والعشرون

## فەرموودەی بیست وحەوتەم

عَـــنْ أَبِي مُـــوسَى(رضي الله عنه)، عَـــنِ النَّبِـــيِّ (ﷺ) قَـــالَ: " تَعَاهَـــدُوا الْقُرْآنَ، فَوَالَّـذِي نَفْـسُ مُحَمَّـدٍ بِيَـدِهِ لَهُـوَ أَشَـدُّ تَفَلُّتًـا مِـنَ الإِبِـلِ فِي عُقُلِهَا "

ئـەبو موسـای ئەشـعەری (خـوا لێـی ڕازی بێت)دەگێڕێتەوە:کـە پێغەمبـــەری خـــوا (دروودو ســـەلامی خـــوای لەســـەر بێت)فەرموویەتی:((هەمیشە قورئان دەور بکەنەوە، سوێند بـەوەی کە گیـانی منـی بەدەستە، قورئـان زووتـر لـەبیر دەچێتەوە،کاتێك دەوری قورئـان نەکرێتـەوە هـەتا ووشـتر، کاتـێ لـە پـەت بـەر دەبێ،چونکە کە ووشتر پەتەکە دەپسێنێ وڕادەکات، هـیچ کەسـێ ناتوانێ بیگەڕێنێتەوە))

## تەخریج

أخرجه البخاري في كتاب فضائل القرآن ،بَابُ:(اسْتِذْكَارِ القُرْآنِ وَتَعَاهُدِهِ)،(رقم الحديث:٥٠٣٣)(ص١٣٠١)،وأحمد في المسند في مسند ابن مسعود(رضي الله عنه)،(رقم الحديث :٤٠٢٠) (١٢٠/٧)،والبيهقي في شعب الإيمان في باب:(في تَعْظِيمِ القُرآن) ، فَصْلٌ: (فِي إِدْمَانِ تِلَاوَةِ الْقُرْآنِ)،(رقم الحديث:١٨٠٩)(ص١٣٤)،وفي السنن الصغير في كتاب فضائل القرآن،بَابُ:(التَّرْغِيبِ فِي تَعَلُّمِ الْقُرْآنِ وَتَعْلِيمِهِ وَتِلاوَتِهِ)،(رقم الحديث: ٩٦٣)(٢٦٧/١)،،وابن أبي شيبة في كتاب الصلوات،باب:(مَا أُمِرَ بِهِ مِنْ تَعَاهُدِ الْقُرْآنِ)،(رقم الحديث:٨٥٦٩)(٢٤٢/٢)،وعبدالرزاق الصنعاني كتاب فضائل القرآن، بَابُ:(تَعَاهُدِ الْقُرْآنِ وَنِسْيَانِهِ)، (رقم الحديث:٥٩٨٦)(٢١٨/٣)،وأبو يعلي الموصلي في مسنده (رقم الحديث: ٧٢٦٨)(٢٢٩/٦)

عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: " إِنَّمَا مَثَلُ صَاحِبِ الْقُرْآنِ كَمَثَلِ صَاحِبِ الْإِبِلِ الْمُعَقَّلَةِ، إِنْ عَاهَدَ عَلَيْهَا أَمْسَكَهَا، وَإِنْ أَطْلَقَهَا ذَهَبَتْ "

**عەبدوڵڵای کوڕی عومەر(خوا لێی ڕازی بێت)فەرمووی:پێغەمبەری خوا(دروودو سەلامی خوای لەسەر بێت)فەرموویەتی:(نموونەی قورئانخوێنی ئەزبەر وەك نموونەی خاوەن حوشتر وایە چۆن ئەگەر ئاگاداری وچاودێری ووشترەکەی بکا،ئەوا ووشترەکەی بۆ دەمێنێ،بەڵام ئەگەر بەڕەڵای بکات، ئەوا ووشترەکە ڕادەکا و لە دەستی دەردەچێ،بە هەمان شێوازیش ئەزبەری قورئانخوێن ئەگەر خەریکی بێ و موراجەعەی بەردەوامی بکا ولە نوێژەکان**

بیانخوێنێ، ئەوا لەبەری دەمینێ و بە ڕەوانی،وە ئەگەر خەریکی نەبێ وموراجەعەی بەردەوامی نەکا ولە نوێژەکان نەیانخوێنێ ، ئەوا لەبەری نامینێ ولەبیری دەچێتەوە .

## تەخریج

أخرجه البخاري في كتاب فضائل القرآن ،بَابُ:(اسْتِذْكَارِ القُرْآنِ وَتَعَاهُدِهِ)(رقم الحديث:٥٠٣١)(ص١٣٠٠)،ومسلم في كتاب صلاة المسافرين وقصرها)،بَابُ: (الْأَمْرِ بِتَعَهُّدِ الْقُرْآنِ،وَكَرَاهَةِ قَوْلِ نَسِيتُ آيَةَ كَذَا،وَجَوَازِ قَوْلِ أُنْسِيتُهَا)،(رقم الحديث :٢٢٦-٧٨٩) (ص٣٥٥) ،والنسائي في كتاب الافتتاح باب:(جَامِعُ مَا جَاءَ فِي الْقُرْآنِ)(رقم الحديث:٩٤٢)(ص١٥٦)، صححه الألباني في صحيح سنن النسائي (٣١٤/١).وفي السنن الكبرى في كتاب الصلاة،باب:(جَامِعُ مَا جَاءَ فِي الْقُرْآنِ) (رقم الحديث: ١٠١٦) (٤٨٦/١)،وابن ماجة في كتاب الأدب باب :(ثَوابُ القُرآن)(رقم الحديث٣٧٨٣)(ص٦٢٤)،صححه الألباني في صحيح سنن ابن ماجة (رقم الحديث :٣٠٦٥)(٢٣٩/٣)،وأحمد في المسند في مسند ابن عمر(رضي الله عنهما)(رقم الحديث :٤٦٦٥)(٢٩١/٨)،والبيهقي في شعب الإيمان باب:(في تَعْظِيمِ القُرآن)، فَصْلٌ :(فِي إِدْمَانِ تِلَاوَةِ الْقُرْآنِ)(رقم الحديث:١٨١٠)،(١٣٥/٤)،والبيهقي في السنن الكبرى في كتاب الصلاة بَابُ:(الْمُعَاهَدَةِ عَلَى قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ)(رقم الحديث :٤١٠٨) (٢٧/٥)،والبغوي في شرح السنة في كتاب فضائل القرآن،بَابُ:(تَعَهُّدِ الْقُرْآنِ وَوَعِيدِ مَنْ نَسِيَهُ)،(رقم الحديث:١٢٢١)(٢٧٠/٣)،وابن حبان في كتاب الرقائق،باب:(ذِكْرُ تَمْثِيلِ الْمُصْطَفَى(ﷺ) الْمُوَاظِبَ عَلَى قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ، وَالْمُقَصِّرَ فِيهَا بِالْإِبِلِ الْمُعَقَّلَةِ ) (رقم الحديث:٧٦٤)(ص٣١٤)

## سوودو پەندەکان

١. بەردەوامبوون لە خوێندنەوەی قورئان،وخوێندنەوەی قورئان لە نوێـــژەکان، وموراجەعـــە کردنـــەوەی ڕۆژانـــەی قورئـــان ، ئەزبەرکردنی قورئان بە هێز دەکـات و وای لـێ دەکـات قورئـان ڕەوان بکات.

٢. ئەزبەرکردنی قورئان بە بەستنەوەی حوشتر بەستراوەتەوە،هەر کەسـێك پارێزگـاری بکـات لـە ئەزبـەر کردنەکـەی بـەهۆی بەردەوامبوون لە خوێندنەوەی قورئـان، وخوێندنـەوەی قورئـان لە نوێژەکان،وموراجەعە کردەوەی ڕۆژانەی قورئان ، وەك ئەوە وایـە کـە حوشـترەکەی بـە جـوانی بەسـتبێتەوە، هـەر کەسـێك پارێزگاری نەکات لـە ئەزبـەرکردنی قورئـان وئیهمـالی بکـات بـە بەردەوامنەبوون لە خوێندنەوەی قورئان، ونەخوێندنـەوەی ئـەو ســـورەتانەی قورئـــان کـــە لەبەریـــەتی لـــە نوێـــژەکان، وموراجەعەنەکردەوەی ڕۆژانەی قورئان،وەك حوشـتری ڕاکـردوو وایە وگوناهبار دەبێت،بەڵام ئەگەر لەبیرچوونەوەیەکی ئاسـایی بێـت وەك سروشـتی مـرۆڤ ئـەوا گوناهبـار نابێـت، بـەڵام ئەگـەر لەبیرچـــونەوەکە بـــەهۆی ئیهمـــالی بـــوو، ئـــەوا هەڕەشـــەکە دەیگرێتەوە .

٣. ئەگەر سێ جوزئـت لەبـەر کردبـوو ، بـەڵام لـەبیرت چـووبۆوە ، هەوڵ بدە بچیت بۆ لەبەر کردنی جوزئەکانی تر .

# الحديث الثامن والعشرون: بیست وهەشتەم

عَنِ ابْنِ عُمَرَ، رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ « إِذَا قَامَ صَاحِبُ الْقُرْآنِ فَقَرَأَهُ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ ذَكَرَهُ وَإِنْ لَمْ يَقُمْ بِهِ نَسِيَهُ »

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر(خوا لێ یان ڕازی بێت)فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودو سەلامی خوای لەسەر بێت)فەرموویەتی :(ئەگەر خاوەنی قورئان کە قورئانی هەموو لەبەرە یان بەشێکی لەبەرە،قورئانەکەی موڕاجەعەکردەوە لە نوێژەسوونەتەکانی ڕۆژ وشەونوێژەکانی ئەوا قورئانەکەی لەبیر ناچێت ولە سینگی جێگیر دەبێت،وە ئەگەر قورئانەکەی موڕاجەعە نەکردەوە لە نوێژە سوونەتەکانی ڕۆژ و شەونوێژەکانی ئەوا قورئانەکەی لەبیر دەچێت)

## تەخریج

أخرجه مسلم في كتاب صلاة المسافرين وقصرها،بَابُ:(الْأَمْرِ بِتَعَهُّدِ الْقُرْآنِ، وَكَرَاهَةِ قَوْلِ نَسِيتُ آيَةَ كَذَا، وَجَوَازِ قَوْلِ أُنْسِيتُهَا) ،(رقم الحديث:٢٢٧ -(٧٨٩) (ص٣٥٥) ،والبيهقي في شعب الإيمان في باب:(فِي تَعْظِيمِ الْقُرْآن)، فَصْلٌ:(فِي إِدْمَانِ تِلَاوَةِ الْقُرْآنِ)،(رقم الحديث:١٨١١) (١٣٦/٤)، والنسائي في السنن الكبرى في كتاب فضائل القرآن باب:( نِسْيَانُ الْقُرْآنِ) ،(رقم الحديث(٧٩٨٩)(٢٦٨/٧)

## سوودو پەندەکان

١. جێگیر کردنی ئەزبەرکردنی قورئان بەوە دەبێت کە قورئانەکەی موراجەعە بکاتەوە لە نوێژەسوونەتەکانی ڕۆژ و شەونوێژەکانی ئەوا قورئانەکەی لەبیر ناکات ولە سینگی جێگیر دەبێت،وە ئەگەر قورئانەکەی موراجەعە نەکردەوە لە نوێژە سوونەتەکانی ڕۆژ و شەونوێژەکانی ئەوا قورئانەکەی لەبیر دەچێت.

٢. موراجەعەکردنی قورئان لە نوێژ ئەزبەرکردن بەهێزو جێگیر دەکات .

٣. موراجەعە نەکردنی قورئان لە نوێژ ئەزبەرکردن لاواز دەکات ولەبیرت دەچێتەوە .

٤. دوو جــۆر لەبیرچــونەوە هەیە:یەكــەمیان لەبیرچــونەوەیەكی نیعمـــــەت، دووەمیـــــان: لەبیرچـــــونەوەیەكی نیقمـــــەت. لەبیرچونەوەیەكی نیعمەت:ئەو جۆرە لەبیرچـونەوەیە كـە باشـە لەبیری بكەی وەكو ئەوەی یەكێكی نزیكت دەمریـت زۆر خـەمی لیّ دەخۆی،یـان یادەوەریـە خـەمبارو نـاخۆش سـەختەكان كـە چاك وایە لەبیری بكەی،بۆیە خوای گەورە یارمەتیدەرت دەبێـت بۆ لەبیرچونەوەی ئەو یادەوەریە خەمبارو ناخۆش سەختانە تـا كاروباری ژیانت بە جوانی ببەیتە سەر ، وە گوناهبار نابیـت بـە لەبیرچونەوەی.

٥. لەبیرچـونەوەیەكی نیقمـەت: ئەمــەش ئـەو لەبیرچـونەوەیە كـە لـــــەبیركردنی دەبێتـــــە زەرەر لـــــە دونیـــــا وەك خوێنـــــدن وتاقیكردنــەوەی قوتابخانــە كــە لــەبیرتكرد ئــەوا نمرەیــەكی كەمدەهێنی و لـە شـوێنێكی نـزم وەردەگیرێیـت ، وە هـەروەها دەبێتــــــــە زەرەری دوارۆژ وەك لـــــــەبیركردنی قورئـــــــان وزانستەشەرعیەكان كە لەبیركردنی سزای توندی لەسەرە

# الحديث التاسع والعشرون

## فەرموودەی بیست ونۆیەم

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُود (ﷺ)، عَنِ النَّبِيَ (ﷺ) قَالَ: وَلا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ نَسِيتُ آيَةَ كَيْتَ وَكَيْتَ، بَلْ هُوَ نُسِّيَ))

**عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود(خوا لێی ڕازی بێت)فەرمووی: پێغەمبەری خوا(دروودو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: کەس لە ئێوە نەڵێت قورئانم لەبیر کرد، ئەوها وئەوها، بەڵکو با بڵێت لەبیرخۆم بردەوە )**

## تەخریج

أخرجه البخاري في كتاب فضائل القرآن، بَابُ:(اسْتِذْكَارِ القُرْآنِ وَتَعَاهُدِهِ)،(رقم الحديث: ٥٠٣٢)،( ص١٣٠٠)،ومسلم في كتاب صلاة المسافرين وقصرها، بَابُ :(الْأَمْرِ بِتَعَهُّدِ الْقُرْآنِ، وَكَرَاهَةِ قَوْلِ نَسِيتُ آيَةَ كَذَا، وَجَوَازِ قَوْلِ أُنْسِيتُهَا)،(رقم الحديث:٢٢٩ -(٧٩٠)، (ص٣٥٦)، وابن حبان في كتاب الرقائق، باب:( ذِكْرُ الزَّجْرِ عَنْ أَنْ يَقُولَ الْمَرْءُ نَسِيتُ آيَةَ كَيْتَ وَكَيْتَ) (رقم الحديث:٧٦١)،(ص٣١٣ )، وابن أبي شيبة في كتاب فضائل القرآن، باب:(مَا أُمِرَ بِهِ مِنْ تَعَاهُدِ الْقُرْآنِ)(رقم الحديث:٧٥٦٨)(٢٤٢/٢)،والبيهقي في السنن الكبرى ، كتاب الصلاة، بَابُ:(الْمُعَاهَدَةِ

عَلَى قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ)،(رقم الحديث:٤١٠٩)،(٢٧/٥)،وعبدالرزاق الصنعاني في مصنفه في كتاب فضائل القرآن،بَابُ:(تَعَاهُدِ الْقُرْآنِ وَنِسْيَانِهِ)،(رقم الحديث:٥٩٨٧) (٢١٨/٣)

عَنِ عَبْدِ اللَّهِ ابْنِ مَسْعُودٍ(رضي الله عنه)، قَالَ: " بِئْسَمَا لأَحَدِهِمْ أَنْ يَقُولَ: نَسِيتُ آيَةَ كَيْتَ وَكَيْتَ، بَلْ هُوَ نُسِّيَ "

**عەبدوللای كوڕی مەسعود(خوا لێی ڕازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خوا (دروودو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی : نەگبەتی بۆ ئەو كەسەی كە ئەڵێت قورئانم لەبیر كرد ، ئەوها و ئەوها ، بەڵكو با بڵێت لەبیرخۆم بردەوە )**

# تەخریج

أخرجه البخاري في كتاب فضائل القرآن،بَابُ:(اسْتِذْكَارِ الْقُرْآنِ وَتَعَاهُدِهِ)،(رقم الحديث :٥٠٣٢)،(ص١٣٠٠)،ومسلم في كتاب صلاة المسافرين وقصرها،بَابُ:(الْأَمْرِ بِتَعَهُّدِ الْقُرْآنِ، وَكَرَاهَةِ قَوْلِ نَسِيتُ آيَةَ كَذَا،وَجَوَازِ قَوْلِ أُنْسِيتُهَا)،(رقم الحديث:٢٢٨ - ٧٩٠)،(ص٣٥٦)، والترمذي في كتاب القراءات عن رسول الله(صلى الله عليه وسلم)،باب:()،(رقم الحديث:٢٩٤٢)،(ص٦٥٧)، صححه الألباني في صحيح سنن الترمذي(١٧٤/٣)،والنسائي في كتاب الافتتاح جَامِعُ مَا جَاءَ فِي الْقُرْآنِ،(رقم الحديث:٩٤٢)،(ص١٥٦)،صححه الألباني في صحيح سنن النسائي (٣١٤/١)،وفي السنن الكبرى في كتاب ذكر الإمامة والجماعة،باب:(جامِعُ ما جاءَ في القُرْءان)،(رقم الحديث:١٠١٧) ، (٤٨٦/١)، والدارمي في كتاب فضائل القرآن، بَابُ:(فِي تَعَاهُدِ الْقُرْآنِ)،(رقم الحديث:٣٢٢٦)،(٨٩٧/٢)،والبيهقي في السنن الكبرى في كتاب الصلاة، بَابُ:(الْمُعَاهَدَةِ عَلَى قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ)،(رقم الحديث:٤١١٠)، (٢٨/٥)،وعبدالرزاق

الصنعاني في مصنفه في كتاب فضائل القرآن،بَابُ:( تَعَاهُدِ الْقُرْآنِ وَنِسْيَانِهِ)،(رقم الحديث:٥٩٨٦) (٢١٨/٣)،والبغوي في شرح السنة في كتاب فضائل القرآن، بَابُ:(تَعَهُّدِ الْقُرْآنِ وَوَعِيدِ مَنْ نَسِيَهُ)،(رقم الحديث: ١٢٢٢)(٢٧١/٣)

## سوودو پەندەکان

١. هیچ کەسێك قورئانی لەبیرناچێتەوە لە خۆیەوە بەلکو لەبیرخۆی دەباتەوە بەهۆی ئیهمال کردنی موراجەعەکردنەوەی ڕۆژانە و هەفتانە ، وە بەهۆی نەخوێندنی لە نوێژەسوننەتەکانی شەو ورۆژ.

٢. بۆ ئەوەی قورئانت لە بیر نەچێتەوە هەوڵ بدە لەگەڵ پێنج هاوڕێت هەفتانە خەتمێکتان هەبێت بەو شێوەیەی خوارەوە :بۆ نمونە لە سورەتی بەقەرە دەست پێدەکەن:

أ. خەتمەی هەفتەی یەکەم : هەر یەکەو ئایەتێك لە ئەزبەر بخوێنێتەوە ، بۆ نمونە یەکەم کەس ئایەتی یەکەم دەخوێنێتەوە ، دووەم کەس ئایەتی دووەم دەخوێنێتەوە ، وە کەسی سێهەم ئایەتی سێهەم دەخوێنێتەوە ، وە کەسی چوارەم ئایەتی چوارەم دەخوێنێتەوە ، وە کەسی پێنجەم ئایەتی پێنجەم دەخوێنێتەوە ، دواتر نۆرەی کەسی یەکەم دێتەوە ، تا قورئان خەتم دەکەن.

ب. خه‌تمه‌ی هه‌فته‌ی دووه‌م : هه‌ر یه‌كه‌و دوو ئایه‌ت بخوێننه‌وه ، بۆ نمونه یه‌كه‌م كه‌س ئایه‌تی یه‌كه‌م و دووه‌م ده‌خوێنێته‌وه ، دووه‌م كه‌س ئایه‌تی سێهه‌م وچواره‌م ده‌خوێنێته‌وه ، وه‌ كه‌سی سێهه‌م ئایه‌تی پێنجه‌م وشه‌شه‌م ده‌خوێنێته‌وه ، وه‌ كه‌سی چواره‌م ئایه‌تی حه‌فته‌م وهه‌شته‌م ده‌خوێنێته‌وه ، وه‌ كه‌سی پێنجه‌م ئایه‌تی نۆیه‌م وده‌یه‌م ده‌خوێنێته‌وه ، دواتر نۆره‌ی كه‌سی یه‌كه‌م دێته‌وه به‌و جۆره دوو ئایه‌ت دوو ئایه‌ت ده‌خوێننه‌وه ، تا قورئان خه‌تم ده‌كه‌ن.

ت. خه‌تمه‌ی هه‌فته‌ی سێهه‌م : هه‌ر یه‌كه‌و سێ ئایه‌ت له‌ ئه‌زبه‌ر بخوێننه‌وه ، بۆ نمونه یه‌كه‌م كه‌س ئایه‌تی یه‌كه‌م و دووه‌م و سێهه‌م ده‌خوێنێته‌وه ، دووه‌م كه‌س ئایه‌تی چواره‌م وپێنجه‌م وشه‌شه‌م ده‌خوێنێته‌وه ، وه‌ كه‌سی سێهه‌م ئایه‌تی حه‌فته‌م وهه‌شته‌م ونۆیه‌م ده‌خوێنێته‌وه ، وه‌ كه‌سی چواره‌م ئایه‌تی ده‌یه‌م ویازده‌یه‌م ودوازده‌یه‌م ده‌خوێنێته‌وه ، وه‌ كه‌سی پێنجه‌م ئایه‌تی سێزده‌یه‌م وچوارده‌یه‌م وپازده‌یه‌م ده‌خوێنێته‌وه ، دواتر نۆره‌ی

کەسی یەکەم دێتەوە بەو جۆرە سێ ئایەت سێ ئایەت دەخوێننەوە ، تا قورئان خەتم دەکەن.

پ. خەتمەی هەفتەی چوارەم : هەر یەکەوپێنج ئایەت لە ئەزبەر بخوێننەوە ، بۆ نمونە یەکەم کەس ئایەتی یەکەم و دووەم و سێهەم وچوارەم وپێنجەم دەخوێنێتەوە ، دووەم کەس ئایەتی شەشەم وحەفتەم وهەشتەم ونۆیەم ودەیەم دەخوێنێتەوە ، وە کەسی سێهەم ئایەتی یازدەیەم ودوازدەیەم وسێزدەیەم وچواردەهەم وپازدەهەم دەخوێنێتەوە ، وە کەسی چوارەم ئایەتی شازدەیەم وحەڤدەیەم وهەژدەیەم نۆزدەیەم وبیستەم دەخوێنێتەوە ، وە کەسی پێنجەم ئایەتی بیست ویەك و بیست ودوو و بیست وسێ و بیست وچوار و بیست وپێنجەم دەخوێنێتەوە ، دواتر نۆرەی کەسی یەکەم دێتەوە بەو جۆرە پێنج ئایەت پێنج ئایەت دەخوێننەوە ، تا قورئان خەتم دەکەن.

ج. خەتمەی هەفتەی پێنجەم : هەر یەکەو لاپەڕەیەك لە ئەزبەر بخوێنێتەوە ، بۆ نمونە یەکەم کەس لاپەڕەی یەکەم

دەخوێنێتەوە ، دووەم كەس لاپەڕی دووەم دەخوێنێتـەوە ، وە كەسـی سـێهەم لاپـەڕی سـێهەم دەخوێنێتـەوە ، وە كەسی چوارەم لاپەڕی چوارەم دەخوێنێتەوە ، وە كەسـی پێنجـەم لاپـەڕی پێنجـەم دەخوێنێتـەوە ، دواتـر نـۆرەی كەسی یەكەم دێتەوە ، تا قورئان خەتم دەكەن.

ح. خەتمەی هەفتەی شەشەم : هـەر یەكـەو پـەڕێك لـە ئەزبـەر بخوێنێتـــەوە ، بـــۆ نمونـــە یەكـــەم كـــەس پـــەڕی یەكـــەم دەخوێنێتەوە ، دووەم كەس پەڕی دووەم دەخوێنێتەوە ، وە كەسی سێهەم پەڕی سێهەم دەخوێنێتەوە ، وە كەسـی چوارەم پەڕی چوارەم دەخوێنێتەوە ، وە كەسـی پێنجـەم پەڕی پێنجەم دەخوێنێتەوە ، دواتر نۆرەی كەسـی یەكـەم دێتەوە ، تا قورئان خەتم دەكەن.

# الحديث الثلاثون: فەرموودەی سییەم

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ(ﷺ)، عَنِ النَّبِي (ﷺ)، قَالَ: ‹ مَا أَذِنَ اللَّهُ لِشَيْءٍ مَا أَذِنَ لِنَبِي يَتَغَنَّى بِالْقُرْآنِ »

**ئەبو هورەیرە(خوا لێی ڕازی بێت)دەڵێ:پێغەمبەری خوا(دروودو سەلامی خوای لەسەر بێت)فەرموویەتی:(خوای پەروەردگار موڵەتی هیچ شتێك نەداوە بەقەد مۆڵەتی بە پێغەمبەر(دروودو سەلامی خوای لەسەر بێت) كە قورئان بخوێنێت بە جوانترین شێواز ودەنگی بە قورئان برازێنێتەوە)**

# تەخریج

أخرجه البخاري في كتاب فضائل القرآن بَابُ:(مَنْ لَمْ يَتَغَنَّ بِالقُرْآنِ)،(رقم الحديث :٥٠٢٣)، (ص١٢٩٩) .،ومسلم في كتاب صلاة المسافرين وقصرها، بَابُ:( اسْتِحْبَابِ تَحْسِينِ الصَّوْتِ بِالْقُرْآنِ) ،(رقم الحديث:٣٢ -(٧٩٢)(ص٣٥٦)،وأبو داود في كتاب الصلاة، بَابُ:(اسْتِحْبَابِ التَّرْتِيلِ فِي الْقِرَاءَةِ)،(رقم الحديث: (١٤٧٣)(ص٢٢٩)، وصححه الألباني في صحيح سنن أبي داود (٤٠٥/١)،والنسائي في كتاب الافتتاح، باب:( تَزْيِينُ الْقُرْآنِ بِالصَّوْتِ)،(رقم الحديث: ١٠١٧) (ص١٦٧) وصححه الألباني في صحيح سنن النسائي (٣٣٢/١)،وفي السنن الكبرى في كتاب الصلاة، باب:( تَزْيِينُ الْقُرْآنِ بِالصَّوْتِ) ،(رقم الحديث:١٠٩١)(٤٨٦/١)،وأحمد في المسند في مسند أبي

هريرة(رضي الله عنه)(رقم الحديث:٧٨٣٢)(٢٢٩/١٣)،وابن حبان في كتاب الرقائق،بابُ:(ذِكْرُ إِبَاحَةِ تَحْزِينِ الصَّوْتِ بِالْقُرْآنِ إِذِ اللَّهُ أَذِنَ فِي ذَلِكَ) ،(رقم الحديث :٧٥١) (ص٣١١)،والدارمي في كتاب الصلاة، بَابُ:(التَّغَنِّي بِالْقُرْآنِ)،(رقم الحديث :١٥٢٩) (٣٧٢/١)،والبيهقي في شعب الإيمان باب:(في تعظيم القرآن)، فَصْلٌ:( فِي تَحْسِينِ الصَّوْتِ بِالْقِرَاءَةِ وَالْقُرْآنِ)،(رقم الحديث:١٩٥٦)(٢٨٠/٤)،وفي السنن الكبرى في كتاب الصلاة ،بَابُ :(كَيْفَ قِرَاءَةُ الْمُصَلِّي)، (رقم الحديث:٢٤٦٢)(٤٣٣/٣)،وفي السنن الصغير في كتاب فضائل القرآن ، بَابٌ:( فِي تَرْتِيلِ الْقُرْآنِ وَتَحْسِينِ الصَّوْتِ بِهِ،(رقم الحديث:٩٩٧)(٢٧٨/١)،وابن أبي شيبة في كتاب الصلوات ، باب:(فِي حُسْنِ الصَّوْتِ بِالْقُرْآنِ)، (رقم الحديث:٨٧٤٠) (٢٥٨/٢)،وأبو يعلي الموصلي في مسنده في حديث أبي هريرة(رضي الله عنه)،(رقم الحديث :٥٩٣٣) (٢٨٣/٥)،وعبدالرزاق الصنعاني في مصنفه في كتاب الصلاة،بَابُ:(النَّائِمِ وَالسَّكْرَانِ وَالْقِرَاءَةِ عَلَى الْغِنَاءِ)،(رقم الحديث :٤١٧٧) (٣١٨/٢)،والبغوي في شرح السنة في كتاب فضائل القرآن،بَابُ:(التَّغَنِّي بِالْقُرْآنِ) (١٢١٧) (٢٦٥/٣)

عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبِ (رضي الله عنه) ، عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: "زَيِّنُوا الْقُرْآنَ بِأَصوَاتِكُمْ"

**بەرِائی کوڕی عازەب(خوا لێی ڕازی بێت)دەگێڕێتەوە،کە پێغەمبەری خوا(درووود وسەلامی خوای لەسەر بێت)فەرموویەتی: قورئان برازێننەوە بە خۆشی وجوانی دەنگەکانتان)**

**ئەم فەرمودەیە مەقلوبە واتە دەنگەکانمان بە قورئان دەرازێنینەوە نەوەك قورئان بە دەنگەکانمان برازێنینەوە ، قورئان خۆی جوانە**

پێویستی بە هیچ شتێك نینە تا جوانی بكات ، بەڵكو دەنگانمان پێویستی بە جوانكردنە بە قورئان جوان دەبێت)

# تەخریج

اخرجه أبو داود في كتاب أول كتاب الصلاة بَابُ:(اسْتِحْبَابِ التَّرْتِيلِ فِي الْقِرَاءَةِ)(رقم الحديث :١٤٦٨)(ص٢٢٧)،صححه الألباني في صحيح سنن أبي داود (٤٠٤/١)،والنسائي في كتاب الافتتاح باب:(تَزْيِينُ الْقُرْآنِ بِالصَّوْتِ)،(رقم الحديث: ١٠١٥)(ص١٦٦) صححه الألباني في صحيح سنن النسائي(٣٣٢/١)،وابن ماجة في كتاب الأذان والسنة فيها ،بَابٌ:(فِي حُسْنِ الصَّوْتِ بِالْقُرْآنِ)،(رقم الحديث :١٣٤٢)(ص٢٣٨)،صححه الألباني في صحيح سنن ابن ماجة(رقم الحديث: ١١١١)(٣٩٩/١)،والنسائي في السنن الكبرى في كتاب المساجد، باب : (تَزْيِينُ الْقُرْآنِ بِالصَّوْتِ)،(رقم الحديث:١٠٨٩)(٢٦/٢)،وابن خزيمة في صحيحه في كتاب الإمامة في الصلاة، بَابُ:(التَّغْلِيظِ فِي تَرْكِ تَسْوِيَةِ الصُّفُوفِ، تَخَوُّفًا لِمُخَالَفَةِ الرَّبِّ(عَزَّ وَجَلَّ) بَيْنَ الْقُلُوبِ) (رقم الحديث:١٥٥١) (٧٤٧/١)، وابن حبان في كتاب الرقائق ، باب:(ذِكْرُ إِبَاحَةِ تَحْسِينِ الْمَرْءِ صَوْتَهُ بِالْقُرْآنِ) (رقم الحديث:٧٤٩) (ص٣١٠)،،والبيهقي في باب(في تعظيم القرآن) ، فَصْلٌ :(فِي تَحْسِينِ الصَّوْتِ بِالْقِرَاءَةِ وَالْقُرْآنِ)، (رقم الحديث:١٩٥٤)(٢٧٧/٤)،وفي السنن الصغير، في كتاب فضائل القرآن، بَابٌ: (فِي تَرْتِيلِ الْقُرْآنِ وَتَحْسِينِ الصَّوْتِ بِهِ)،(رقم الحديث:١٠٠٦)(٢٨٠/١)،وفي السنن الكبير في كتاب الصلاة،بابُ:(كَيفَ قراءةُ المُصَلِّي)،(رقم الحديث:٢٤٦٢)(٤٣٣/٣)،وابن أبي شيبة في المصنف في كتاب الصلوات باب:( فِي حُسْنِ الصَّوْتِ بِالْقُرْآنِ) ،(رقم الحديث:٨٧٣٧)(٢٥٨/٢)،وابو يعلي الموصلي في في حديث البراء بن عازب، (رقم

الحديث:١٧٠١) (١٥٧/٢)،والدارمي في كتاب فضائل القرآن ،بابُ:(التَّغَنِّي بِالْقُرْآنِ)، (رقم الحديث:٣٣٧٢)(٩٢٩/٢).

## سوودو پەندەکان

١. پێویستە قورئان بە جوانترین شێواز بخوێنینەوە .
٢. پێویستە زمانەکانمان بە قورئان جوان و شیرین بکەین.
٣. قورئان خۆی جوانە پێویستی بە زمان نیە تا جوانتری بکات، بەڵام زمانمان پێویستی بە قورئانە تا جوانتری بکات
٤. قورئان خوێندنەوە بە تەجوید تامێکی تایبەت دەدات بە قورئان.
٥. پێویستە مافی پیتەکانی قورئان بدەین لەکاتی تەرتیل کردنی قورئاندا .

# الحديث الحادي والثلاثون

# فەرموودەی سی ویەکەم

عَنْ أَبِي مُوسَى (ﷺ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) لأَبِي مُوسَى «لَوْ رَأَيْتَنِي وَأَنَا أَسْتَمِعُ لِقِرَاءَتِكَ الْبَارِحَةَ، لَقَدْ أُوتِيتَ مِزْمَارًا مِنْ مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ» فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، لَوْ عَلِمْتُ مَكَانَكَ لَحَبَّرْتُهُ لَكَ تَحْبِيرًا .

ئەبو موسای ئەشعەری (خوا لێی ڕازی بێت) فەرمووی:پێغەمبەری خوا(درووودو سەلامی خوای لەسەر بێت) بە ئەبو موسای ئەشعەری (خوا لێی ڕازی بێت)فەرموو: (( ئەی ئەبوو موسا: ئەگەر دەتزانی کە دوێنێ من گوێم لێت ڕاگرتبوو کە قورئانت دەخوێند،زۆر جوانت دەخوێند،خوای پەروەردگار ئاوازێکی خۆشی پێداویت، بێگومان خوای پەروەردگار دەنگ وئاوازە خۆشەکەی پێغەمبەر داوود (درووودو سەلامی خوای لەسەر بێت)ی پێ بەخشیوە)(( ئەبو موسای ئەشعەری (خوا لێی ڕازی بێت)فەرمووی:((گوتم :ئەی پێغەمبەری خوا ، ئەگەر دەمزانی تۆ گوێت لە من گرتووە ، ئەوا زۆر بە جوانتر دەمخوێندەوە .

## تەخریج

أخرجه البخاري في كتاب فضائل القرآن، بَابُ:(حُسْنِ الصَّوْتِ بِالقِرَاءَةِ لِلْقُرْآنِ) (رقم الحديث :٥٠٤٨)(ص١٣٠٣)،ومسلم في كتاب صلاة المسافرين وقصرها،بَابُ: (اسْتِحْبَابِ تَحْسِينِ الصَّوْتِ بِالْقُرْآنِ) (رقم الحديث:٢٣٥ - (٧٩٣)(ص٣٥٧)،والنسائي في كتاب الافتتاح باب: (تَزْيِينُ الْقُرْآنِ بِالصَّوْتِ) (رقم الحديث:١٠١٩) (ص١٦٧)، وصححه الألباني في صحيح سنن النسائي(٣٣٢/١)،وابن ماجة في كتاب المساجد والجماعة بَابٌ:( فِي حُسْنِ الصَّوْتِ بِالْقُرْآنِ) (رقم الحديث:١٣٤١) (ص٢٣٧)، وحسنه الألباني في صحيح سنن ابن ماجة (رقم الحديث :١١١١) (٣٩٩/١)،وابن حبان في كتاب إخباره عن مناقب الصحابة (رضي الله عنهم) باب:( ذِكْرُ قَوْلِ أَبِي مُوسَى لِلْمُصْطَفَى (صلى الله عليه وسلم) أَنْ لَوَ عَلِمَ مَكَانَهُ لَحَبَّرَ لَهُ) (رقم الحديث:٧١٩٧) (ص١٩٢٨)، والبيهقي في شعب الإيمان في باب:(في تعظيم القرآن) فَصْلٌ :(فِي تَحْسِينِ الصَّوْتِ بِالْقِرَاءَةِ وَالْقُرْآنِ)(رقم الحديث:١٩٦٢)،وفي سنن الكبرى في كتاب الصلاة، بابُ: (مَن جَهَرَ بها إذا كان مَن حَولَه لا يَتأَذَّى بقِراءَتِهِ) (رقم الحديث:٤٧٧٠) ،(٣٧٨/٥)، وأبو يعلي الموصلي في مسنده في مسند أنس بن مالك(رضي الله عنه) (٣٩٦/٣)،والبغوي في شرح السنة في كتاب فضائل القرآن، بَابُ:(التَّغَنِّي بِالْقُرْآنِ)،(رقم الحديث:١٢١٩)(٢٦٧/٣)، والدارمي في كتاب الصلاة بَاب:( التَّغَنِّيْ بِالقُرآنِ) (رقم الحديث: (١٤٦٠)(٣٧٢/١)،وعبدالرزاق الصنعاني في مصنفه في كتاب الصلاة بَابُ:(حُسْنِ الصَّوْتِ) (٤١٨٨)(٣٢٠/٢)

## سوودو پەندەكان

١. دەنگخۆشی بەهرەیەکی خوای پەروەردگارە ، واتە کەسبی نیە و بە هەوڵ وکۆشش نیە .

٢. دەنگخۆشی کاریگەری تایبەتی خۆی هەیە بەسەر مرۆڤەکان.

٣. سوننەتە ئەوانەی دەنگیان خۆشە بانگبدەن تا خەڵکی هانبدرێت بۆ نوێژی بە کۆمەڵ.

٤. گوێگرتن لە قاریئێکی دەنگخۆش کاریگەری زۆر زیاترە لە قاریئێکی دەنگناخۆش.

# الحديث الثاني والثلاثون

## فەرمووده‌ى سى ودووەم

قالَ أبو هُرَيْرَةَ (ﷺ): سَمعْتُ النَّبيِّ (ﷺ)يقولُ:(إنَّ أَوَّلَ النَّاس يُقْضَى يَوْمَ الْقيَامَة عَلَيْه رَجُلٌ اسْتُشْهدَ، فَأُتِيَ بِه، فَعَرَّفَهُ نعمَهُ، فَعَرَفَهَا قَالَ: فَمَا عَملْتَ فيهَا؟، قَالَ: قَاتَلْتُ فيكَ حتَّى اسْتُشْهدْتُ . قَالَ: كَذَبْتَ، وَلَكنَّكَ قَاتَلْتَ لأَنْ يُقَالَ:جَرِيءٌ، فَقَدْ قيلَ ثُمَّ أمرَ بِه فَسُحبَ عَلَى وَجْهِه حَتَّى أُلْقيَ فِي النَّارِ وَرَجُلٌ تَعَلَّمَ العلْمَ وَعلَّمَهُ،وَقَرَأَ الْقُرْآنَ، فَأُتِيَ بِه،فَعَرَّفَهَ نعَمَهُ فَعَرَفَهَا، قالَ: فَمَا عَملْتَ فيهَا؟ قَالَ: تَعلَّمْتُ الْعلْمَ وَعَلَّمْتُهُ،وَقَرَأْتُ فيكَ الْقُرْآنَ قَالَ: كَذَبْتَ، وَلَكنَّكَ تَعَلَّمْتَ الْعلْمَ ليُقَالَ: عَالمٌ، وَقَرَأْتَ الْقُرْآنَ ليُقَالَ: هُوَ قَارِئٌ، فَقَدْ قيلَ. ثُمَّ أُمرَ بِه فَسُحبَ عَلَى وَجْهِه حَتَّى أُلْقيَ فِي النَّارِ وَرَجُلٌ وَسَّعَ اللَّهُ عَلَيْه، وَأَعْطَاهُ منْ أَصْنَاف الْمَال كُلِّه، فَأُتِيَ بِه، فَعَرَّفَهُ نعَمَهُ، فَعَرَفَهَ قَالَ: فَمَا عَملْتَ فيهَا؟ قَالَ:مَا تَرَكْتُ منْ سَبيلٍ تُحبُّ أَنْ يُنْفَقَ فيهَا إلا أَنْفَقْتُ فيهَا لَكَ قَالَ: كَذَبْتَ، وَلَكنَّكَ فَعَلْتَ ليُقَالَ: هُوَ جَوَادٌ، فَقَدْ قيلَ ثُمَّ أُمرَ بِه فَسُحبَ عَلَى وَجْهِه حَتَّى أُلْقيَ فِي النَّارِ.)) وفي الحديث: إنَّ مُعَاويَةَ لَمَّا بَلَغَهُ هذا الحديثُ بَكَى حتَّى غُشيَ عليه فلمَّا أَفَاقَ قالَ: (صَدَقَ اللَّهُ ورسولُهُ، قالَ اللَّهُ عزَّ وجلَّ }:

﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَٰلَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا

يُبْخَسُونَ ﴿١٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِي ٱلْأٓخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُ وَحَبِطَ مَا صَنَعُواْ فِيهَا وَبَٰطِلٞ مَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾ (هُود ٥ ٦ )

ئەبو هورەیرە فەرموویەتی:گوێم لە پێغەمبەری خوا(درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی:یەکەم کەس کە قەزاوەتی لەگەڵ دەکرێت، کەسێکە بەناو شەهید بووە، دەیهێنن،وە کارەکەی دەهێنرێت کە شەهید بوونە خاوەنەکەی دەناسێتەوە، وەخاوەنەکەشی دەیناسێتەوە،پێی دەگۆترێت چیت کردووە لەو شەو شەهیدبوونەت ؟ ئەویش دەڵێ:(من جەنگاوم لە پێناوت تا شەهید بووم،وەلامی دەدرێتەوە: درۆت کرد،بەلکو کوشتارت کرد تا پێت بوترێت:جوامێرە، پاڵەوانە، ئازایە، ئەوەشت پێووترا،دواتر فەرمان دەکرێ کە لەسەر ڕوخسار بەرەو دۆزەخ ڕابکێشرێ .

وە کەسێك کە زانست فێربووە وخەڵکیشی فێر کردووە ،وە قورئانیشی خوێندۆتەوە، کەسەکە دەهێنرێت،وە نیعمەتەکەش دەهێنرێت،کەسەکە نیعمەتەکەی دەناستەوە،وە نیعمەتەکەش کەسەکە دەناسێتەوە،وە بە کەسەکە دەوترێت: چیت کردووە بەو نیعمەتە؟ ئەویش دەڵێ:زانست فێر بووم،وە خەڵکیشم فێر کردووە،وە لە پێناو تۆدا قورئانم خوێندووە، وە خەڵکیشم فێر

كردووه،وەلاّمی دەدرێتەوە: درۆت كرد ، بەلاّم زانست فێر بـووی تـا پێت بووترێت:زانایە،وە قورئانت خوێند تا پێت بووترێت:قاریئـە،وە پێشت ووترا،دواتر فەرمان دەكرێ كە لەسەر ڕوخسار بـەرەو دۆزەخ ڕابكێشرێ .

وە كەسـێكی دەوڵەمەنـد دەهێنرێـت كـە خـوای گـەورە لـە هـەموو جۆرەكـانی مـاڵی پـێ بەخشـیوە،وە نیعمەتەكـەی دەهێنرێت،ئـەو كەســە نیعمەتەكــەی دەناســیتەوە،وە نیعمەتەكــەش كەســەكە دەناسێتەوە ، پێی دەوترێ چـیت بـەو نیعمەتـە كـردووە ؟ ئـەویش دەڵێ:هیچ شوێنێك نیە كە پێت خۆشە بەخشینی تیـا بكرێـت تـەنها بەخشیومە لە پێناوت، پێی دەوترێت:درۆت كرد ، بۆیـە بەخشـیوتە تا پێت بووترێت : دەستڕۆیە ، ئەویشت لە دونیا پێت ووتـرا، دواتـر فەرمان دەكـرێ كـە لەسـەر ڕوخسـار بـەرەو دۆزەخ ڕابكێشـرێ .وە كاتێك ئیمامی موعاویەی كوڕی ئەبی سوفیان (خوا لێـی ڕازی بێـت) گوێی لەوفەرموودەیە بوو گریا تا لە هۆش خۆی چـوو ،كـە بـە ئاگـا هاتــەوە فــەرمووی:(خواو پێغەمبەرەكــەی ڕاســتیان فــەرمووە ، وە خوای پەروەردگار دەفـەرموێ ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَٰلَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ ﴿١٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُ ۖ وَحَبِطَ مَا صَنَعُوا۟ فِيهَا وَبَٰطِلٌ مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾﴾ (هُود ٥ ٦ )

## تەخریج

أخرجه مسلم في كتاب الإمارة، بَابُ:(مَنْ قَاتَلَ لِلرِّيَاءِ وَالسُّمْعَةِ اسْتَحَقَّ النَّارَ)،(رقم الحديث :١٥٢-(١٩٠٥)(ص٩١٩)،والبيهقي في شعب الإيمان في باب:(في تفضيل القرآن) ،فَصْلٌ:(فِي تَرْكِ الْمُبَاهَاةِ بِقِرَاءَةِ الْقُرْآنِ ، (رقم الحديث:٢٣٧٨) ،والنسائي في كتاب الجهاد باب:(مَنْ قَاتَلَ لِيُقَالَ فُلانٌ جَرِيءٌ) (رقم الحديث:٣١٣٧)(ص٤٨٤)،(صححه الألباني في صحيح سنن النسائي (٣٨٢/٢)،والترمذي في كتاب الزهد،باب:(ما جاءَ في الرِّياء والسُّمْعَةِ)،(رقم الحديث:٢٣٨٢) (ص٥٣٦)، صححه الألباني في صحيح سنن الترمذي (٥٥٦/٢)،والنسائي في السنن الكبرى في كتاب فضائل القرآن،باب:(مَنْ رَاءَى بِقِرَاءَةِ الْقُرْآنِ) (رقم الحديث:٨٠٢٩)(٢٨٤/٧)،وأحمد في المسند في مسند أبي هريرة(رضي الله عنه)،(رقم الحديث:٨٢٧٧)(٢٩/١٤)،والبيهقي في السنن الكبرى في كتاب السير، بَابُ:(بَيَانِ النِّيَّةِ الَّتِي يُقَاتِلُ عَلَيْهَا لِيَكُونَ فِي سَبِيلِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ) (رقم الحديث:١٨٥٨٩)(٥٥٣/١٨)،وابن خزيمة في صحيحه في كتاب الزكاة،بَابُ:(التَّغْلِيظِ فِي الصَّدَقَةِ، مُرَاءَاةً وَسُمْعَةً، وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّ الْمُرَائِيَ بِالصَّدَقَةِ مِنْ أَوَائِلِ مَنْ تَسْتَعِرُ بِهِمُ النَّارُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. بِاللَّهِ نَعُوذُ مِنَ الرِّيَاءِ وَالسُّمْعَةِ،وَاللَّهَ نَسْأَلُ أَنْ يُعِيذَنَا مِنَ النَّارِ بِعَفْوِهِ)(رقم الحديث:٢٤٨٢) (١١٨٨/٢)

## سوودو پەندەکان

١. مەرج نیە هەموو جار كرداری چاكە ببێتە هۆی پاداشت وەرگرتنەوە، بەڵكو جاری وا هەیە لەسەری قەرزدار دەبیتەوە .

٢. ئەگەر كردارێكی چاكەت كرد وە نیەتت ڕەزامەندی خەڵك بوو واتە چاكەكەت بۆ ڕیابازی بوو ، ئەوا چاكەكەت دەگۆڕێت بۆ گوناە و تاوانبار دەبیت.

٣. ئەگەر كردارێكی چاكەت كرد وە نیەتت عوجب بوو ، واتە كەیفت بەخۆ هات كە ئەو كردارە چاكەت كردووە ، ئەوا چاكەكەت دەگۆڕێت بۆ گوناە و تاوانبار دەبیت.

٤. كەسی بانگخواز یان خاوەن زانستێكی شەرعی ئەگەر مەبەستی ناودەركردن و شوهرەت وناوبانگ بوون بوو ئەوا ڕیسەكەی لێ دەبێتەوە خوری لە بری پاداشت تەنها گوناهی بۆ دەنوسرێت چونكە نیەتی خراپ بووە .

٥. ئەگەر كەسێك قورئان بخوێنێت بۆ تازیە وبۆ پارە پەیداكردن ودەنگە خۆشەكەی بقۆزێتەوە بۆ ناودەركردن و شوهرەت وناوبانگ بوون بوو ئەوا ڕیسەكەی لێ دەبێتەوە

خوری لە بری پاداشت تەنها گوناهی بۆ دەنوسرێت چـونکە نیەتی خراپ بووە .

٦. ئەگەر یەکێك خێر وسـەدەقە ببەخشـێت بـۆ نـاودەرکردن و شوهرەت وناوبانگ بوون بوو ، وە بۆ ئەوەی لە دونیـا پێـی بڵێن کەسـێکی دەسـڕۆیە ، ئـەوا ڕیسـەکەی لـێ دەبێتـەوە خوری لە بری پاداشت وتەنها گوناهی بۆ دەنوسرێت چونکە نیەتی خراپ بووە .

٧. ئەگـەر یـەکێك بچـێتە جیهـاد بـۆ نـاودەرکردن و شـوهرەت وناوبانگ بوون بوو ، لە دونیا مەبەستی ئەوە بوو پێی بڵـێن پیـاوێکی ڕەشـید و ئـازاو چاونەترسـە ئـەوا ڕیسـەکەی لـێ دەبێتـەوە خـوری لـە بـری پاداشـت تـەنها گونـاهی بـۆ دەنوسرێت چونکە نیەتی خراپ بووە .

# الحديث الثالث والثلاثون

## فەرموودەی سی وسێیەم

عَنْ أَبِي مَالك الأَشْعَرِيِّ (ﷺ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّـه (ﷺ)قَالَ ا وَالْقُرآنُ حُجَّةٌ لَكَ أَوْ عَلَيْكَ، كُلُّ النَّاسِ يَغْدُو، فَبَائِعٌ نَفْسَهُ فَمُعْتِقُهَا، أَوْ مُوبِقُهَا )

ئیمام مالیکی ئەشعەری (خوا لێی ڕازی بێت) کە پێغەمبەری خوا (درودو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی : قورئان یان دەبێتە بەڵگەنامەو حوجەت بەرەو بەهەشتی پان وبەرینت دەبات چونکە پەیڕەوت کردبوو، یان دەبێتە بەڵگەنامە وحوجەت لە دژت، بەرەو ئاگری دۆزەخت دەبات، چونکە پەیڕەوت نەکردبوو ، هەموو خەڵکی بەردەوام بە کاری خۆیانەوە خەریك دەبن ، هەیانە خۆی بە خوای پەروەردگار دەفرۆشێت بە پەیڕەوکردنی شەریعەتی خوا بەمەش نەفسی خۆی لە دیلی قوتار دەکات ، هەشیانە هەر خۆی بە دیلی دەهێڵێتەوە کە خۆی بە شەیتان دەفرۆشێت و فەرمانەکانی شەیتان پەیڕەو دەکات و خۆی بە فەتارەت دەبات .

## تەخریج

أخرجه مسلم في كِتَابِ الطَّهَارَةِ ، بَابُ:(فَضْلِ الْوُضُوءِ)،(رقم الحديث:١- (٢٢٣) (ص١٢١)،والنسائي في كتاب الزكاة ،بَابُ:(وُجُوبِ الزَّكَاةِ)،(رقم الحديث:٢٤٣٧) (ص٣٧٨)،صححه الألباني في صحيح سنن النسائي (١٧٤/٢)،والترمذي في كتاب الدعوات باب:() ، (رقم الحديث:٣٥١٧)(ص٧٩٨)، صححه الألباني في صحيح سنن الترمذي (٤٤٦/٣)،وابن ماجة في كتاب الطهارة وسننها ، بَابٌ:(الْوُضُوءُ شَطْرُ الْإِيمَانِ )، (رقم الحديث:٢٨٠)(ص٦٦)، صححه الألباني في صحيح سنن ابن ماجة (رقم الحديث:٢٢٩)(١٠٦/١)،والنسائي في السنن الكبرى في كتاب الزكاة باب (وُجُوبُ الزَّكَاةِ)، (رقم الحديث:٢٢٢٩) (٦/٣)،وابن حبان في كتاب الرقائق باب:( ذِكْرُ تَفَضُّلِ اللَّهِ جَلَّ وَعَلَا عَلَى حَامِدِهِ بِإِعْطَائِهِ مِلْءَ الْمِيزَانِ ثَوَابًا فِي الْقِيَامَةِ) (رقم الحديث:٨٤٤)(ص٣٣٣)،والبيهقي في شعب الإيمان بَابٌ:(فِي الطَّهَارَاتِ) ،( رقم الحديث:٢٤٥٣) (١٢٧/٥) ،والبيهقي في السنن الكبرى ،(جِماعُ أبواب سُنَّةِ الوُضوءِ وفَرضِهِ)، بَابُ :(فَرْضِ الطُّهُورِ وَمَحَلِّهِ مِنَ الْإِيمَانِ) (رقم الحديث:١٨٧) (١٢٩/١)

## ژیانی ئەبو مالیكی ئەشعەری

**ناوی كەعبی كوڕی عاصیمی ئەشعەریە ، بە پاپۆڕ لەگەڵ ئەشعەریەكان هاتە خزمەت پێغەمبەر (درودو سەلامی خوای لەسەر بێت) وە موسوڵمان بوو ، بیست وحەفت فەرمودەی لە پێغەمبەر (درودو سەلامی خوای لەسەر بێت)گێڕاوەتەوە.**

# سوودو پەندەكان

١. لە ڕۆژی دوامایی،لە ڕۆژی مەحشەر،لە ڕۆژی دادگایی خوای پەروەردگار، لەم ڕۆژەدا پاداشتی قورئان یان دەبێتە بەڵگەنامەو حوججەت بەرەو بەهەشتی پان وبەرینت دەبات چونكە پەیڕەوت كردبوو، یان دەبێتە بەڵگەنامە وحوججەت لە دژت ، بەرەو ئاگری دۆزەخت دەبات ، چونكە پەیڕەوت نەكردبوو .

٢. ئەبو موسای ئەشعەری كاتێك والی مەدینە بوو،سێسەد لە ئەزبەرانی قورئانی كۆكردەوە و ووتارێكی پێشكەش كردن و پێی ووتن:((إن هذا القرآن كائن لكم أجراً أو كائن عليكم وزراً)**واتە:**ئەو قورئانە یان دەبێتە پاداشت بۆ ئەوانەی كاریان پێ كردووە، یان لەسەرتان دەبێتە گوناە، چونكە شاهێدیتان لەسەر لێ دەدات كە پەیڕەویتان نەكردووە، و بەرەو دۆزەختان دەبات .

٣. هەموو مرۆڤێك كۆت وزنجیری دۆزەخ بەوە دەشكێنێ كە كرداری چاك بكات لە ڕەزامەندی خوای پەروەردگار .

# الحديث الرابع والثلاثون

# فەرموودەی سی وچوارەم

عَـنْ أَبِي سَـعِيدِ بْـنِ المُعَـلَّى(رضي الله عنه )، قَـالَ: كُنْـتُ أُصَـلِّي، فَـدَعَانِي النَّبِــيّ(صلى الله عليه وسلم )فَلَــمْ أُجِبْــهُ، قُلْــتُ: يَــا رَسُــولَ اللَّــهِ إِنِّي كُنْــتُ أُصَلِّي،قَالَ(صلى الله عليه وسلم ):"أَلَمْ يَقُلِ ال هُ: اسْتَجِيبُوا لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَـاكُمْ؟"، ثُمَّ قَالَ (صلى الله عليه وسلم ): ‹ أَلاَ أُعَلِّمُكَ أَعْظَمَ سُورَةٍ فِي القُرْآنِ قَبْلَ أَنْ تَخْرُجَ مِـنَ المَسْجِدِ › ، فَأَخَذَ بِيَدِي، فَلَمَّا أَرَدْنَا أَنْ نَخْـرُجَ، قُلْـتُ: يَا رَسُولَ اللَّـهِ، إِنَّكَ ،لْتَ ‹ لَأُعَلِّمَنَّكَ أَعْظَمَ سُورَةٍ مِنَ القُـرْآنِ » قَـالَ (صلى الله عليه وسلم ): ‹ الحَمْـدُ لِلَّهِ رَبِّ العَالَمِينَ، هِيَ السَّبْعُ المَثَانِي، وَالقُرْآنُ العَظِيمُ الَّذِي أُوتِيتُهُ »

ئـەبو سـەعیدی کـوڕی موعـەللا دەگێڕێتـەوە:من نوێـژم دەکرد،لـە ساتی نوێژکردنەکەم پێغەمبەری خوا(درودو سـەلامی خـوای لەسـەر بێت)بـانگی کـردم،منیش وەڵامـم نەدایـەوە چـونکە لـەناو نویـژدا بووم،دوای تەواوبوونی نوێژەکەم گوتم:ئەی پێغەمبەری خـوا(درودو سـەلامی خـوای لەسـەر بێـت)من لـە نـاو نوێـژدا بـووم بۆیـە وەڵامـم نەدایتـەوە، پێغەمبـەری خـوا (درودو سـەلامی خـوای لەسـەر بێـت) فەرمووی: ئـەی خـوای پـەروەردگار نەیفـەرمووە:﴿ ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ

وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ ﴾الأنفال:٢٤، واتە: ((ئەگەر خوای پەروەردگار وپێغەمبەرەكەی (دروودو سەلامی خوای لەسەر بێت) بانگهێشتیان كردن بۆ كارێك یان فەرمانیكی پێ كردن یان شتێكی لێ قەدەغەكردن ئێوەش یەكسەر وەڵامیان بدەنەوە))پێغەمبەری خوا (درودو سەلامی خوای لەسەر بێت)فەرمووی:ئایا گەورەترین وگرنگترین وشكۆمەندترین سورەتت پێ بڵێم لە قورئان پێش ئەوەی لە مزگەوت دەرچیت؟،پێغەمبەری خوا (درودو سەلامی خوای لەسەر بێت)دەستی گرتم، كاتێك ویستمان كە لە مزگەوت دەربچین، ووتم ئەی پێغەمبەری خوا(درودو سەلامی خوای لەسەر بێت)تۆ فەرمووت:گەورەترین وگرنگترین وشكۆمەندترین سورەتت لە قورئان پێ دەڵێم،پێغەمبەری خوا (درودو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرمووی:سورەتی(﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝ ﴾ الفاتحة: ٢ ، كە سورەتی فاتیحەیە، كە سبع المثاني یە و قورئانی پیرۆزە كە بۆم هاتووە)

## تەخریج

أخرجه البخاري في كتاب فضائل القرآن بَابُ:(فَضْلِ فَاتِحَةِ الكِتَابِ)، (رقم الحديث: ٥٠٠٦)(ص١٢٩٥)،وأبو داود في كتاب الصلاة (أبواب قراءة القرآن وتحزيبه وترتيله)، بَابُ:(فَاتِحَةِ الْكِتَابِ)(رقم الحديث:١٤٥٨)(ص٢٢٦) ،صححه الألباني في صحيح سنن أبي داود (٤٠١/١)،وابن ماجة في كتاب الأدب، بَابُ:(ثَوَابِ الْقُرْآنِ)، (رقم الحديث:٣٧٧٩)(ص٦٢٣)، صححه الألباني في صحيح سنن ابن ماجة (رقم الحديث:٣٠٦١)(٢٣٨/٣)،والنسائي في كتاب الافتتاح ، بابُ:(تَأْوِيلُ قَوْلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ: {وَلَقَدْ آتَيْنَاكَ سَبْعًا مِنَ الْمَثَانِي، وَالْقُرْآنَ الْعَظِيمَ} [الحجر: ٨٧] ، (رقم الحديث:٩١٣) (ص١٥١) ، صححه الألباني في صحيح سنن(٣٠٢/١)،والنسائي في السنن الكبرى في كتاب الصلاة ،باب:(تَأْوِيلُ قَوْلِ اللهِ جَلَّ ثَنَاؤُهُ، وَلَقَدْ آتَيْنَاكَ سَبْعًا مِنَ الْمَثَانِي)،(رقم الحديث:٩٨٧)(٤٧٢/١)،والدارمي في كتاب فضائل القرآن، باب :(فَضْلِ فَاتِحَةِ الْكِتَابِ)،(رقم الحديث:٣٢٤٨)(٩٠٢/٢)،وابن حبان في كتاب الرقائق ،بابُ:(ذِكْرُ الْبَيَانِ بِأَنَّ فَاتِحَةَ الْكِتَابِ هِيَ أَعْظَمُ سُورَةٍ فِي الْقُرْآنِ، وَهِيَ السَّبْعُ الْمَثَانِي الَّتِي أُوتِيَ مُحَمَّدٌ(ﷺ) )، (رقم الحديث:٧٧٧)(ص٣١٧)،والبيهقي في شعب الإيمان في باب:(في تعظيم القرآن)،فصل:(ذِكْرُ فَاتِحَةِ الْكِتَابِ)(رقم الحديث: ٢١٣٨)(٤٢١/٤)،والبيهقي في السنن الكبرى في كتاب النكاح ،بابُ:(ما أُبيحَ له مِن أن يَدعوَ المُصَلِّيَ فيُجيبَه وإن كان في الصَّلاةِ )(رقم الحديث:١٣٥٢٨) (٥٤٦/١٣)، وابن خزيمة في كتاب الصلاة بَابُ :(ذِكْرِ مَا خَصَّ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ بِهِ نَبِيَّهُ (ﷺ)، وَأَبَانَ بِهِ بَيْنَهُ وَبَيْنَ أُمَّتِهِ مِنْ أَنْ أَوْجَبَ عَلَى النَّاسِ إِجَابَتَهُ وَإِنْ كَانُوا فِي الصَّلَاةِ، إِذَا دَعَاهُمْ لِمَا يُحْيِيهِمْ) (رقم الحديث:٨٦٢)(٤٣٧/١)

## ژیانی ئەبو سەعیدی کوڕی موعەللا

ناوی رافعی كوڕی موعەللای كوڕی لوزانە ، موسولّمان بوو، وە پێغەمبەر (درودو سەلامی خوای لەسەر بێت) لەگەڵ سەفوانی كوڕی بەیزا كردیە برا ، وە دوو فەرمودەی لە پێغەمبەر (درودو سەلامی خوای لەسەر بێت) گێڕاوەتەوە ، بەژداری جەنگی بەدری كردووە كە لە ساڵی دووەمی كۆچی بەرپا بوو ،و هەر لەو جەنگە بە دەستی عیكریمەی كوڕی ئەبو جەهل شەهید كرا )

## سوودو پەندەكان

١. سورەتی فاتیحە پێنجەم سورەتە كە دابەزیبێت .

٢. نوێژ بە بێ خوێندنی سورەتی فاتیحە دروست نیە و بەتاڵە .

٣. بەرزترین و گرنگترین سورەت لە قورئان سورەتی فاتیحەیە .

٤. خوێندنەوەی سورەتی فاتیحە ڕوكنێكە لە ڕوكنەكانی نوێژ .

٥. ناوەكای سورەتی فاتیحە

- السبع المثاني
- أم القرآن
- أم الكتاب
- سورة الحمد

- الشافية
- الكافية
- الوافية

٦. خوێندنەوەی سورەتی فاتیحە ڕوقیەیە .

٧. پێویستە بچیتە لای زانایەك كە پێداچوونەوە بو خوێندنـەوەی سورەی فاتیحەت بۆ بكـات ، وە ئەگـەر كـەس بـۆی نـەكردیت تـەنها بـە بەرامبـەری مـاددی نـەبێت ، ئـەوا دەبێـت پارەكـە بـدەیت بـۆ ئـەوەی فاتیحەكـەت ڕەوان بكـەیت ، چـونكە وەك ئـەوە وایـە كـە لـە شـوێنێك بیـت ودەسـتنوێژت نـەبێت ، ئـاو بكڕیت بۆ دەستنوێژ .

# الحديث الخامس والثلاثون

## فەرموودەی سی و پێنجەم

عَنْ أَبِي أُمَامَةَ البَاهِلِيِّ (رضي الله عنه)، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم)، يَقُولُ: ‹ اقْرَءوا الْقُرْآنَ، فَإِنَّهُ يَأْتِي شَافِعًا لأَصْحَابِهِ، اقْرَءوا الزَّهْرَاوَيْنِ الْبَقَرَةَ وَآلَ عِمْرَانَ، فَإِنَّهُمَا يَأْتِيَانِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَأَنَّهُمَا غَمَامَتَانِ أَوْ غَيَايَتَانِ، أَوْ فِرْقَانِ مِنْ طَيْرٍ صَوَافَّ تُحَاجَّانِ عَنْ صَاحِبِهِمَ، اقْرَءوا الْبَقَرَةَ، فَإِنَّ أَخْذَهَا بَرَكَةٌ، وَتَرْكَهَا حَسْرَةٌ، وَلا يَسْتَطِيعُهَا الْبَطَلَ ›.

ئەبو ئومامەی باهلی(خودا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێ : گوێم لە پێغەمبەری خوا (درودو سەلامی خوای لەسەر بێت) بوو فەرمووی :((قورئان بخوێنن ، چونکە لە ڕۆژی دوامایی پاداشتەکەی دەبێتە تکاکار بۆ خاوەنەکانیان کە پەیڕەوی قورئانیان کردوە ، وە دوو زەهراوەین بخوێنن کە دوو سورەتی بەقەرە و ئال عیمرانە ، ئەو دوو سوڕەتە لە ڕۆژی دوامایی پێشیان دەکەون، ئەو دوو سورەتە وەك دوو پەڵە هەور داپۆشتبوون ، یان وەك دوو چەتر پۆشتەیان لێ یان کردبوو ،یان وەکو دوو پۆڵە چۆلەکەی ریزکراو پاڵپشتی دەکەن لە خاوەنەکەیان کە پەیڕەوی قورئانی پیرۆزیان کردبوو، ئێوە بەردەوام و زۆر سوڕەتی بەقەرە بخوێنن، چونکە

خوێندنـەوەی بەرەكەتـە، وە وازهێنـان لـە خوێندنـەوەی پەشـیمان بونەوەيـە،وە ئـەو كەسـەی كەسـوڕەتی بەقـەرە دەخوێنێتـەوە لـە دەست جادوگەران دەپارێزرێت ))

## تەخريج

أخرجه مسلم في كتاب صلاة المسافرين وقصرها ،بَابُ :(فَضْلِ قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ، وَسُورَةِ الْبَقَرَةِ)(رقم الحديث:٢٥٢-(٨٠٤)،(ص٣٦٢)،وابن حبان في صحيحه في كتاب العلم باب:( ذِكْرُ الْحَثِّ عَلَى تَعْلِيمِ كِتَابِ اللَّهِ، وَإِنْ لَمْ يَتَعَلَّمِ الْإِنْسَانُ بِالتَّمَامِ) (رقم الحديث:١١٦) (ص١٤٤)،وأحمد في مسنده في مسند أبي أمامة الباهلي ،(رقم الحديث:٢٢٢١٣)(٥٤٦/٣٦) وقال المحققون:حديث صحيح .والدارمي في كتاب فضائل القرآن، بَابُ:(فِي فَضْلِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ وَآلِ عِمْرَانَ )(رقم الحديث:٦٢٦٨) (٩٠٧/٢)، والبيهقي في شعب الايمان بابٌ :(فِي تَعْظِيمِ الْقُرْآنِ) ، فَصْلٌ :(فِي ذِكْرِ سُورَةِ البَقَرَةِ وآلِ عِمْرانِ )(رقم الحديث: ٢١٥٦) (٤٤٤/٤) ،والبيهقي في السنن الصغير في كتاب فضائل القرآن ، بَابٌ (فِي فَضْلِ الْقُرْآنِ وَتَخْصِيصِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ وَآلِ عِمْرَانَ بِالذِّكْرِ)، (رقم الحديث:٤٦٧ )، (٢٧٠/١) ،والبيهقي في السنن الكبير في كتاب الصلاة بَابُ :(الْمُعَاهَدَةِ عَلَى قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ)، (رقم الحديث:٤١١٣)(٢٩/٥) ، والبغوي في شرح السنة في كتاب فضائل القرآن بَابُ:(فَضْلِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ وَآلِ عِمْرَانَ)، (رقم الحديث:١١٩٠)(٢٤٨/٣)،وعبدالرزاق الصنعاني في مصنفه في كتاب فضائل القرآن بَابُ:(تَعْلِيمِ الْقُرْآنِ وَفَضْلِهِ)، (رقم الحديث:٦٠١٠)(٢٢٣/٣)،

## سوودو پەندەكان

١. هـــەردوو ســـــوورەتی بەقـــەرە وئـــال عیمـــران بـــە دوو ڕۆشنكەرەوەكە ناوزەد كراوە .

٢. خوێندنـــەوەی ئـــەو دوو ســـورەتە و كـــارپێكردن بـــە ناوەڕۆكەكەیان دەبێتە هۆی تكا بۆ خاوەنەكەیان بكات لە ناو گۆڕ و لە ڕۆژی دوامایی .

٣. خوێندنـــەوەی ئـــەو دوو ســـورەتە و كـــارپێكردن بـــە ناوەڕۆكەكەیان دەبێتە هۆی وەرگرتنی ڕوناكی لە ناو گۆڕ و لە ڕۆژی دوامایی.

٤. خوێندنـــەوەی ئـــەو دوو ســـورەتە و كـــارپێكردن بـــە ناوەڕۆكەكـەیان دەبێتـە دوو پەڵـە هـەور لـە ڕۆژی دوامـایی دایاندەپۆشن .

٥. خوێندنـــەوەی ئـــەو دوو ســـورەتە و كـــارپێكردن بـــە ناوەڕۆكەكەیان دەبێتە دوو چەتر لە ڕۆژی دوامایی پۆشـتەیان لێ یان دەكات.

٦. خوێندنـــەوەی ئـــەو دوو ســـورەتە و كـــارپێكردن بـــە ناوەڕۆكەكەیان دەبێتە دوو پۆڵە چۆلەكەی ریزكراو پاڵپشـتی دەكـەن لـە خاوەنەكـەیان كـە پـەیڕەوی قورئـانی پیرۆزیـان كردبوو.

٧. خوێندنـــەوەی ئـــەو دوو ســـورەتە و کـــارپێکردن بـــە ناوەڕۆکەکەیان دەبێتە فەڕ وبەرەکەت بۆ خاوەنەکەیان .

٨. وازهێنـــان لـــە خوێندنـــەوەی ئـــەو دوو ســـورەتە پەشـــیمان بونەوەیە.

٩. ئـەو کەسـەی کەسـورەتی بەقـەرە دەخوێنێتـەوە لـە دەسـت جادوگەران دەپارێزرێت

١٠. خوێندنـــەوەی ئـــەو دوو ســـورەتە و کـــارپێکردن بـــە ناوەڕۆکەکـــەیان دەبێتـــە باشـــترین ســـانگەر و پاڵپشـــت بـــۆ خاوەنەکەیان .

١١. لە نێـو هـاوەڵان هـەر کەسـێك ئـەو دوو سـورەتەی بزانیبوایـە بخوێنێتەوە ئەوا ڕێزو قەدرو مەکانەتی زۆر زیاتر بوو لـە وانـی تر .

١٢. ئەو دوو سورەتە ناوی خوای پەروەردگاری هەر پیرۆزی تیایـە کـە ئەگـەر بـەو نـاوە هـەرە پـیرۆزە داوای لێ بکـەیت وەڵامـت دەداتەوە کە ئەم ناوە هەرە پیرۆزە لە سێ سورەت هاتووە : بەقەرە ، وئـال عیمـران ، طـه .قال النبي (ﷺ) "اسْمُ الله الأَعْظَمُ، الَّذِي إِذَا دُعِيَ بِهِ أَجَابَ، فِي سُوَرٍ ثَلاَثٍ: الْبَقَرَةِ، وَآلِ عِمْرَانَ، وَطَهَ" صحيح سنن ابن ماجة. ومن حديث أسماء بنت يزيد رضي الله عنها قالت: قال رسول الله (ﷺ): "اسْمُ اللَّهِ الأَعْظَمُ فِي هَاتَيْنِ الآيَتَيْنِ :﴿ وَإِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ

الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ ﴾ [البقرة: ١٦٣]، وَفَاتِحَةُ سُورَةِ آلِ عِمْرَانَ :﴿ الم *اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ ﴾ [آل عمران: ١، ٢] صحيح سنن الترمذي.

١٣. شەیتان ناچێتە ماڵێك كە سورەتی بەقەڕەی تیا خوێندرابێت .

١٤. خوێندنەوەی سورەتی بەقەڕە پارێزەر و قەڵغانە لە پیلانەكان و فرت فێڵەكانی شەیتان .

١٥. خوێندنەوەی سورەتی بەقەڕە پارێزەر و قەڵغانە لەوەی هیچ كەسێك سیحرت لیّ بكات ، وە قەڵغانە لە چاوی پیس .

١٦. خوێندنەوەی سورەتی بەقەرە تایبەتمەند كراوە لەبەرئەوەی درێژترین سورەتە لە قورئان .

١٧. خوێندنەوەی سورەتی بەقەرە تایبەتمەند كراوە لەبەر ئەوەی زۆرێك لە ناوە جوانەكانی خوای پەروەردگاری تیایە .

١٨. خوێندنەوەی سورەتی بەقەرە تایبەتمەند كراوە لەبەر ئەوەی زۆرێك لە ئەحكامە فیقهیەكانی تیایە .

١٩. خوێندنەوەی سورەتی بەقەرە تایبەتمەند كراوە لەبەر ئەوەی ئایەتولكورسی تیایە كە دە سیفاتی خوای پەروەردگاری تیایە وە خوای پەروەردگار فەرمانی پێكردووین لەكاتی خەوتن و ویۆدی بەیانیان و ئێواران و دوای هەموو نوێژێكی فەرز بیخوێنین، وە مەزنترین ئایەتە لە قورئان .

